عارف قوربانی

ئەنفال و سەرگوزشتەی

# تەیمور

تاکە ڕزگاربووی ناوگۆڕی بەکۆمەڵی ژن و منداڵە ئەنفالکراوەکان

کوردستان/ 2013

# ئەنفال و سەرگوزشتەی

# تەیمور


- ❖ ناوی کتێب: ئەنفال و سەرگوزشتەی تەیمور
- ❖ نووسەر: عارف قوربانی
- ❖ بابەت : چاوپێکەوتن
- ❖ پیتچنین: رەوەند کەریم
- ❖ بەرگ: ئارام شوانی
- ❖ قەبارەی کتێب: ½ A4
- ❖ تیراژ: (5000)دانە
- ❖ چاپخانە: چاپخانەی کارۆ- سلێمانی

# پێشکەشە

بە هاوڕێ و هاوسەرم ( دونیا ) وەک قوربانیەکی جینۆسایید

کە شەش ئەندامی خێزانەکەی لە هەڵەبجە شەهید بوون،

هەروەها لەبەر ئەوەی هاوکار و یارمەتیدەرمە لە کارەکانم و

ئەم کتێبەش لەسەر بەخشینی کاتەکانی ئەو بەرهەم هاتووە.

## لەبری پێشەکی:

بەدرێژایی ئەو چەند ساڵەی کارم لەسەر ئەنفال کردووە، لەناو هەموو ئەو بەڵگەو دیکۆمێنت و شایەتحاڵانەی لەبەردەست بوون، لەکۆی ئەو زانیاریانەی لەو بارەیەوە بەردەستمانخستبوون، هەستم بە بۆشاییەکەی گەورە دەکرد کە ناتوانرێت ئەنفال بنوسرێتەوە ئەگەر زانیاریەکانی تەیمور تۆمار نەکرێت. بەندە چەندین کتێبم لەسەر ئەنفال نوسیووە، شایەتحاڵەکانی ناو رووداوەکانی ئەنفال لە قوربانی و تەنانەت جەلادیشم دوواندوە، ئەوانەی خۆیان بەرئەنفال کەوتون و بەهەر هۆیەکەوەبوو بێت رزگاریان بووە، چاوپێکەوتنم لەگەڵ کردووون. ئەوانەی لە "تۆپزاوای کەرکوك" ناوەندی کۆکردنەوەی ئەنفال زیندان بوون و ئەوانەی برابوونە کەمپی "دوبز" و ئەوانەی برابوونە شارەکەی سەدام لە "تکریت" دەستبەسەر بوون. ئەوانەی رەوانەی نوگرەسەلمان کرابوون و تەنانەت (فەرەج و عوزێر و واحید و رەمەزان) ئەو چوار گەنجەی کە بە برینداری لە ناو گۆڕەبەکۆمەڵەکان لە بیابانەکانی خواروی عیراقەوە گەڕانەوە، لەسەر هەموویان وەستاوم و بەووردی زانیاریەکانیانم تۆمار کردووە. بەڵام کەلێنێکم لە نوسینەوەی ئەو مێژووە بەدیدەکرد کە ناتوانین بڵێین زانیاریەکانمان تەواون ئەگەر سەرگوزشتەی "تەیمور"ی نەخەینەسەر. هەرچەندە راپۆرتی چاودێری مافی مرۆ (میدڵ ئیست ووچ) بە بایەخەوە هەندێ

زانیاری لەزاری تەیمورەوە خستبووە روو، هەروەها نوسەری عەرەب (کەنعان مەکیە) دیدارێکی لەگەڵ تەیمور سازکردبوو، ئەوانە لە بەردەست بوون، بەڵام لە هەردوکیاندا هەستت بە کەموکورپیەکی زۆر دەکرد کە زانیاریەکان تێروتەسەل نین و "تەیمور" پێویستی بە لەسەروەستانی زیاتر هەیە.

بۆ ئەو مەبەستە ساڵانێکی زۆرە دەمویست دیدارێک لەگەل تەیمور ئەنجام بدەم ئەو بۆشاییانەی زانیاریەکانی ئەنفال پڕبکاتەوە، ئەو لە ساڵی 1996 ەوە چووبووە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بە ئاسان دەستم پێڕانەدەگەیشت. لە دوای روخانی سەدام لەساڵی 2003 جۆرێک لە ئاسانکاری دروست بوو کە ئامانجەکەم بێنمەدی.

چەند جارێک بە رێگەی جۆراو جۆر هەوڵمداوە و سەرکەوتوو نەبووم، لە ساڵی 2009 وا رێککەوتین دیدارەکە ئەنجام بدەین بەڵام دوای ئەوەی گەڕایەوە بۆ کوردستان ماوەیەک بێزار و نیگەران بوو، ئەوجارەش دوامانخست ئەو چووەوە بۆ ئەمریکا. چەندجارێکی تر ئەو بابەتەمان تاوتوێ کردەوە تا لەسەر ئەوە رێککەوتین هاوینی ئەمساڵ 2013 دیدارەکە ئەنجام بدەین.

دانیشتنی یەکەم شەوی 17 لەسەر 18ی تەموز لە "ئۆردوگای سمود" ناحیەی رزگاری لە کاتژمێر 9 دەستمان بە دیدارەکە کرد تا کاتژمێر یەکی شەو بەردەوام بووین، بەشێکی زۆریمان تەواوکرد. دووجاری تر لە رۆژەکانی 8/30 و دواجار لە 9/11 چوومەوە گەرمیان و لە هەمان

خانوو كە ماڵی ئێستای تەیمورە لە گەڕەكی لەئەنفالەكان چاوپێكەوتنەكەم ئەنجامدا. بەدرێژایی ئەو كاتژمێرانەی من پرسیارم لە تەیمور دەكـرد ئەو بەدەم جگەرە كێشانی یەك لـەدوای یەكـەوە وەڵامـی دەدامـەوە. زۆرجـاریش فرمێسـك بـەری چـاوەكانی دەگـرتین و بـۆ ماوەیـەك چاوپێكەوتنەكەمان رادەگرت.

هەر لەدەستپێكی ئەم دیدارەوە تێگەیشتم تەیمور خەمێكی قوڵ ئـازاری دەدات، دەیویست بە دووكەڵی بەردەوامی جگەرەكەی خەمەكانی بەبا بدات. وەك خۆی دەیووت ئاخر تازە ئـەو دڵـی بـووە بـە دوولەتـەوە بەشـێكی لای خۆیـەتی و بەشـەكەی تـری لای گۆڕەبەكۆمەڵەكانـە لـە بیابـان. بـەڵام ئـەو زیـاتر بەسـەر خۆیـدا زاڵ دەبـوو لەگێڕانـەوەی رووداوەكـان، پێدەچـێت مـاوەی ئـەو 25 سـاڵەی بەسـەر ئەنفالـدا تێپـەڕیووە هـەموو شـەوێك وەك شـریتێكی تۆمـاركراو لـەیادەوەری تـەیموردا لێدرابێتـەوە. هـەموو دیمەنـەكان وەك ئـەوەی تەماشـای وێنەیەك بكات لەبەرچـاوی بـوون، تەنانـەت دیمەنـەكانی سـەردەمی منداڵی و زۆر پێش ئەنفالیش هەمووی لەیادەوەریدا پارێزرابوون.

من یەكێ لەئاواتەكانم ئەوەبوو كـە هەمیشـە دوعـام دەكـرد خودایـە نـەمرم تـا هـەر پێـنج دەربازبووەكـەی بیابـان دەدوێـنم. لەمێـژبوو خوازیاری ئەوە بووم ئەو زانیاریی و یادەوەریانەی تـەیمور تۆماربكـەم، ئەویش ئەوەی بەلاوە گرنگ بـوو بەرلـەوەی ماڵئـاوایی لـەژیان بكـات ئەوەی بەسەریدا هاتووە و ئەوەی بینیوێتی وەكوو خۆی تۆماربكرێت و

ببێت بە بەشێک لەمێژووی میللەتەکەی. بۆیە هەردوکمان ئەوەمان پێخۆش بوو گوێ نەدەینە ئەوەی ئەم چاوپێکەوتنە چەند دەخایەنێت و چەند درێژ دەردەچێت، بەلامانەوە مەبەست بوو هەموو سەرگوزشتەی ژیانی تەیمور بنوسرێتەوە.

ئەم کتێبەی بەردەست دەقی تەواوی چاوپێکەوتنەکەیە، مەگەر لە رووی دارشتن و وشەسازییەوە دەستکاریم کردبێت، ئەگینا هەمووی بەسەرهاتی ژیانی تەیمورە نەک قسەی من.

باوەڕیشم وایە کە ئەگەر تەیمور رزگاری نەبوایا لە گۆڕی بەکۆمەڵی ژن و منداڵە ئەنفالکراوەکان و بەزیندوێتی نەگەڕایەتەوە، ئەوە بەدڵنیاییەوە بۆ هەتاهەتایە نوسینەوەی ئەنفال بەنیوەناچڵی دەمایەوە. چونکە تەیمور تاکە شایەتحاڵی زیندوو بوو کە چارەنوسی ژن و منداڵە ئەنفالکراوەکانی دەزانی. یان خوانەخواستە، وەک چۆن " ئەنوەر تەیار و حەمە عەلی عەلەییان" دوو رزگاربووی تری ئەنفال بوون و بەهۆکاری جیاجیا تیاچوون، ئەگەر تەیمور پێش ئەم چاوپێکەوتنە بەهەر هۆیەکەوە بوایا لەژیانا نەمایا ئەوە زۆر لاپەڕەی ئەنفال بەشاراوەیی دەمانەوە.

خۆشبەختانە تەمەن بواری ئەوەی داین و خوا بەشی ئەوە توانای پێ بەخشین ئەم دیدارەش ئەنجام بدەین و بۆ باقی تەمەنیش بەهیوام دەسەڵاتی کوردی ژیانێکی شایستە بۆ تەیمور دەستەبەر بکات بەجۆرێک لانی کەم قەرەبووی ئەو چەرمەسەری و نەهامەتیانەی رابردووی بکاتەوە.

- **تەیموری ئەنفال ناوێکی دیارو تا رادەیەک ناسراوە، بەڵام ئەگەر دەستپێکی پرسیارەکانم ئەوەبێت داوات لێبکەم خۆت خۆت بناسێنی، چی دەڵێیت.؟**

– خۆی ئەوە راستە کە تارادەیەك ناسراوم، بەڵام ژیان و بەسەرهات و چیرۆکی ئازارەکانی من و رووداوەکانی ناو ئەنفال، تەنها ئەوەندە نیە کە باس دەکرێت یان ئەوەی پێی ناسراوم. داوا لە خوای گەورە دەکەم یارمەتیدەرم بێت زاکیرەم بە باشی کار بکات و رووداوەکان هەموویان بێنەوە بەرچاووم تا چیرۆکی ژیانم لەم دیدارەدا بگێڕمەوە، هەوڵ ئەدەم ئەوانەشی لە رابردوودا باسم نەکردون و هێشتا خەڵك نایزانێت بۆت باس بکەم، تا ئەم دیدارە ببێتە چیرۆکی راستەقینەی تەیمور.

- **سوپاست دەکەم و پشت بە خوا وادەکەین، بەڵام پێت نەووتم تەیمور کێ یە؟**

– ناوم تەیمور عەبدوڵا ئەحمەدە، لەڕاستیا ساڵی لە دایك بوونی خۆم نازانم، چونکە باوکم بۆی دەگێڕامەوە ئەوکاتانەی مناڵ بووم زۆر

لاسار بووم و بە مەقەست لایەکی جنسیە نفوسەکەی خۆم بڕیووە، بەڕێککەوت ئەو شوێنەی بەرکەوتووە کە ڕۆژ و مانگ و ساڵی لە دایك بوونمی تیا نوسراوە. دیارە چارەنوسم وابووە کە هەر لە سەرەتای تەمەنمەوە بەو جۆرە دەست بە ژیان بکەم، کە نەزانم لە چی ڕۆژ و مانگ و ساڵێکدا لە دایك بووم و ئیتر تا قەدەر بەو ڕۆژگارانەی گەیاندم کە پێی ناسراوم بە تەیموری ئەنفال.

- **ئێستا لە دەفتەر نفوس و لە جەواز سەفەرەکەت، چی ساڵێک نوسراوە بۆ لە دایک بوونت.؟**

– زۆر دوای ڕووداوەکان خۆم ڕۆژ و مانگ و ساڵی تەمەنی خۆم داناوە بە 1976/1/1. ئێستا لە جنسیە و لە جەواز و هەموو مامەڵەکردنێك ئەوە لە دایك بوونی منە.

- **بەڵام ئەوە بەرواریکی راستە.؟**

– مەبەستت چیە.؟

- **مەبەستم ئەوەیە بۆ دیاریکردنی ئەو وادەیە بۆ لە دایک بوونت، پشتت بە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو بەستووە.؟ بۆ نمونە چویتە دایرەی نفوس و تەماشای سجلی نفوسی بنەماڵەکەت کردبێت، یاخود هیچ نەبێت لە مامێکت یان خاڵێکت ئەو زانیاریەت وەرگرتبێت.؟**

- نەخێر، هەر خۆم بۆ خۆمم داناوە.

- **ئەی بۆ پرسیارت نەکردووە، لە نفوس یان لە کەسوکارت، ئەوانەی لە ژیاندا ماوون.؟**

- نەچومەتە دایرەی نفوس و باوەڕناکەم ناومان لەوێ مابێت، مامەکانیشم نایزانن.

- **چۆن دەزانی کە نایزانن، لە کاتێکدا پرسیارت لێنەکردوون.؟**

- کاکە ئەوکاتە وەك ئێستا نەبوو خەڵك ئێستا پێش ئەوەی لە دایك بێت دەزانێ منداڵەکەی چەنی مانگ لە دایك دەبێت، جاران نیووەی منالی کورد لە جنسێکەی نوسرابوو 7/1، ئیتر زستان لە دایك بووبێت یان بەهار و پایز ئەوان هەر دەیان نوسی یەکی تەموز. لە لادێشدا ئەگەر باش لە بیریان بووایا ئەوە ساڵەکەیان دەزانی ئەویش بە رووداوەکان، دەیانووت سالی گرانیەکە، سالی بەعسیەکە، سالی تاوانەوەی شۆڕش، ئاوا لە یادەوەرییان تۆمار بوو بوو. بەپێی تەمەنم ئەو کاتەی ناسنامەم دەرکرد وامان دانا کە لە دایك بووی 76 بم.

- **دایکت ناوی چی بوو؟**

- دایکم، ئاهههە، ناوی سارا محمد محمود بوو.

- **خەڵکی کوێ بووە؟**

– کوڵەجۆ.

- **ئەی باوکت؟**

– ئەویش هەر خەڵکی کوڵەجۆ بووە.

- **ئەوکات بە زۆری ژن و ژنخوازی لە نێوان خزم و کەسوکاری یەکتریی و یان لە بازنەی چەند گوندێکدا بووە، ئایا دایک و باوکت هیچ خزمایەتیەک هەبووە لە نێوانیاندا.؟**

– باوەڕناکەم، ئەگەر هەشبووبێت خزمی زۆر دوور بوونە لە یەکتریەوە.

- **ساڵی لە دایک بوونی باوکت دەزانی؟**

– بەڵێ، ساڵی 1953 لە دایك بووە.

- **ئەی دایکت؟**

– نا، ئەو نازانم.

- **مەبەستت نیە بیزانی، یان نەتتوانیووە بیدۆزیتەوە.؟**

– وەڵایی کاك عارف لە ڕاستیدا ئەم پرسیارانەی تۆ لە منی دەکەیت، من هیچ ڕۆژێك ئەو پرسیارانەم لە خۆم نەکردووە.

- **بۆ؟**

– ڕەنگە بەشێکی بۆ ئەوەبێت نەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ ئەو ڕۆژگارانە.

- **ئەتوانی لەو ڕابردووە دابڕێیت.؟**

– نەخێر ناتوانم و ناشمەوێ دابڕێم، هەمیشە لەگەڵ ئەو ساتانە دەژیم، بەڵام ناشمەوێ بە دەستی خۆم برینەکانم قوڵتر بکەمەوە.

- **ئەگەر ئەو پرسیارانە لە خۆت بکەیت، یان بە دوای وەڵامەکانیا بگەڕێیت برینەکانت قوڵتر دەبنەوە.؟**

– بەدڵنیاییەوە. ئەزانی 25 ساڵە جنسیە نفوسەکەی دایکم لەماڵی مامم پارێزراوە، تا ئێستا ئەو ئازایەتییەم نەبووە تەنانەت بۆ یەکجار بچم جنسیەکەی دایکم ببینم. زۆریش حەز دەکەم تەماشای بکەم چونکە دایکمە، بەڵام دەشترسم بەرگەی ئازاری بینینەکەی نەگرم.

- **کەواتا ببورە ئازارم دایت، نەدەبوو ئەو پرسیارانە بکەم، من دەمویست بەو جۆرە دەستپێکەین تا یارمەتی زاکیرەت بدەم بگەڕێینەوە بۆ پێش ڕووداوەکان و بۆ ناو خێزانەکەتان و ژیانی ئاساییتان لە لادێ، بۆ ئەوەی چیرۆکی تەیمور بە وردی بنوسینەوە. ئێستا پێت باشە لەو ساتانەوە دەستپێبکەین کە لەلایەن سوپاوە دەستگیرکرایت.؟**

- نا، تۆ بەردەوامبە لەسەر شێوازەکەی خۆت، پێشتر ئیشەکانی تۆم بینیووە لەسەر ئەنفال و زۆر رام لێیەتی و ئەوەش بۆ من باشترە، بەو هۆیەوە یادەوەریەکان دێنەوە بەرچاوم و با هەمووشی بۆ مێژوو بنوسرێت. مەبەستم ئەوە بوو کە من خۆم ئەو پرسیارانەم نەکردووە چونکە تەنها ئازاری زیاتریان پێ دەبەخشیم، بەڵام ئێستا جیاوازە ئەوەتا تۆ دەینوسیتەوە و سبەی دەبێتە بەشێك لە مێژووی کورد.

- **خێزانێکی چەند کەسی بوون لەماڵەوە؟**

- شەش کەس بووین، باوکم و دایکم و من و هەر سێ خوشکەکەم.

- **ئەوکاتەی لەیەك دابڕان ئەوان هەموویان گوللەباران کران و تۆ بە تەنها مایتەوە، بە پێی بۆچوونی خۆت ئەوکات تۆ تەمەنت 12 ساڵان بووە، ئێستا وێنەی ئەوکاتەی دایك و باوك و خوشکەکانت دەناسیتەوە.؟**

- ئەی چۆن نایانناسمەوە، بۆ لەوکاتەوە تا ئێستا وێنەیان لە بەرچاوم لاچووە، تا شێوەیانم بیرچوبێتەوە.

- **ئەگەر ئێستا تۆ بەهرەیەکی هونەریت هەبوایا و هونەرمەندێکی شێوەکاری بوایی، بتوانیایا ئەوەی لە خەیاڵتدایە لە تابلۆیەکدا بینەخشێنی، چۆن وێنەی دایك و باوك و خوشکەکانت دەکێشا.؟**

- کەمێك زیاتر مەبەستی پرسیارەکەتم بۆ روون بکەرەوە.

• **دەمەوێ بزانم شێوەیان چۆن بووە، وەکوو خۆی لە یادەوەریتدا ماونەتەوە.؟**

– بەڵێ، تا ئەو ڕۆژەی دەمرم هەر لە بەرچاومن و ئەگەر لە ڕۆژی حەشریشدا لە ناو ملیۆنان کەسبن دەیان ناسمەوە. باوکم پیاوێکی نیمچە باڵا بەرز بوو، چوارشانەیەکی سپی پێستی موو ڕەشی چاو و برۆ قەوی بوو، شواربێکی ئەستوری شۆڕی هەبوو لە خوارەوە هەڵیگێڕابووەوە بۆ سەرەوە، ئێمە خۆمان جافی رووغزاین باوکم سیمای پیاوێکی روغزایی پێوە دیاربوو، ئەوە نەبێت باوکی خۆم بوو وەسفی بکەم بەڕاستی پیاوێکی زۆر جوان بوو. جامانەیەکی ڕەشی توندی لە سەری دەبەستەوە و دەیهێنایە سەر ناوچەوانی. شێوەی دایکیشم هەمیشە لە بەرچاومە ئەسمەرێکی دەم و چاو بچوکی گەنم ڕەنگ بوو، ڕەنگی قژەکەی زۆر جوان بوو مەیلەو قاوەییەکی تۆخ بوو. خوشکەکانم شێوەیان چوو بووەوە سەر باوکم، سپی پێست بوون و چاو و برۆ قەوی موویان زۆر ڕەش بوو. گێلاس کە لە خوشکەکانی ترم گەورەتر بوو باریکەلەیەکی باڵا بەرز بوو، بەڵام دوو خوشکەکەی ترم هێشتا باڵایان دەرنەکەوتبوو خرپن بوون.

• **تۆ چەندەم کەسی منداڵەکان بوویت، لە پێش و لە دوای تۆ چەند کەس لە دایک بوون؟**

- من له هەموویان گەورەتر بووم، بە دوای منیشدا گێلاس و پاشان لاولاو و دوای ئەویش سنور لە دایك بووە.

- **هەر چوارتان له کوڵەجۆ له دایک بوون.؟**

- نەخێر، من له هەوارەبەرزە و خوشکەکانم لاولاو و سنور له کوڵەجۆ و گێلاس نازانم.

- **ئەی تۆ نەتووت دایک و باوکم خەڵکی کوڵەجۆ بوون و ماڵتان لەوێ بووە، بۆچی تۆ له گوندێکی تر له دایک بوویت و نازانی گێلاسی خوشکیشت لەکوێ له دایک بووە.؟**

- پێش ئەوەی من له دایکبم باوکم ماڵی چووەتە گوندی (هەوارە بەرزە)، گوندێکە هەر نزیکە له کوڵەجۆوە من ئەوکاتە لەوێ لەدایك بووم و دواتر جارێکی تر گەڕاوەتەوە گوندەکەی خۆی.

- **هیچ کات نەتپرسیووە هۆکاری چی بووە بەو جۆرە ماڵیان گوێزاوەتەوە و دواتر گەڕاونەتەوە؟**

- بەڵێ پرسیارم کردووە، دەڵێن کێشەی عەشایەری هەبووە له گوندەکە بە هۆی زەوی و زارەوە بووە، ماڵی باوکم و باپیرم له گوندەکە دەرکراون و ماوەیەك ماڵی باپیریشم له گوندی (درۆزنە) بوونە.

- **کوڵەجۆ، گوندێکی چەند ماڵی دەبوو.؟**

– دێیەکی گەورە بوو نزیکەی 40 بۆ 45 ماڵ دەبوو.

- **گوندەکەتان کارەبای هەبوو.؟**

– نەخێر.

- **قوتابخانەی تیابوو؟**

– بەڵێ، قوتابخانەمان هەبوو، تا پۆلی شەشی سەرەتایی تیابوو.

- **ئەی پێش کردنەوەی قوتابخانە لە گوندەکەتان، جۆرەی خوێندنی ئاینی کە ئەوکات باوبووە بە تایبەت لە بەشێک لە لادێکان هەبووە، یان تەکێی ئاینی لە گوندەکەتان نەبوو.؟**

– نەخێر، تەنانەت مزگەوتیشی تیانەبوو.

- **مامۆستاکانی گوندەکەتان خەڵکی کوێ بوون، کەسیان هەبوو خەڵکی لای خۆتان بووبێت، لە شار بووبێتە مامۆستا و گەڕابێتەوە بۆ ئاوایی؟**

– نەخێر، نەمبیستووە مامۆستای خەڵکی لای خۆمانمان هەبووبێت.

- **تۆ خۆت چوویتە بەر خوێندن؟**

- بەڵێ، تا دووی سەرەتایم خوێند.

- **ئەگەر ساڵی لە دایك بوونەكەت تەواو بێت، لانی كەم دەبێت تا سەردەمی ئەنفال پۆلی پێنج و شەش بوو بێتیت، بۆ تا دووی سەرەتایت خوێندووە.؟**

- چەند ساڵێك پێش ئەنفال قوتابخانە نەما لە گوندەكەمان، ئەوكاتانەی كە ئیتر بەردەوام تۆپ باران دەكراین حكومەت قوتابخانەكانی سەحبكردبۆوە بۆیە تا پۆلی دووم خوێندووە، ئەگینا راستە تەمەنم لەوە گەورەتر بوو پۆلی دوو بم.

- **ناوی هیچ مامۆستایەكی ئەوكاتەی گوندەكەتانت لە یاد ماوە.؟**

- بەڵێ، مامۆستایەكمان هەبوو ناوی حسن بوو وابزانم بە ئەسڵ خەڵكی گوندی درۆزنە بوو، مامۆستایەكی تریشمان هەبوو خەڵكی سەرقەڵا بوو بەڵام ناوی ئەوم بیر نەماوە. مامۆستا حەسەن دوای ئەنفال ماڵی لە سمود بوو، دواتر وابزانم بە نەخۆشی كۆچی دوایی كرد.

- **ئەو منالانەی هاوتەمەنی تۆ بوون و پێكەوە دەتانخوێند چەند كەس بوون.؟**

- وابزانم پۆلەكەمان 20 كەس بووین.

- **ناوی كام لە هاوپۆلەكانت بیر ماوە.؟**

- ئازاد عەتا، سامان کوڕی پورم بوو ئەنفال کرا، سیروان حسێن برای سامان بوو ئەویش هەر ئەنفال کراو لە گۆڕەبەکۆمەڵەکان بەبەرچاوی خۆمەوە گوللەبارانکران. هەر ناوی ئەوانم لە یادە.

- **قوتابیەکی چۆن بوویت.؟**

- وەڵا بە دەمی خۆم نەبێت زیرەك بووم، دەزانم زۆرجار وانەکانم دەزانی و لە پۆلدا مامۆستا دەیووت چەپڵەی بۆ لێبدەن، خۆم وریا بووم و باوکیشم لە ماڵەوە زۆر یارمەتی دەدام بۆ فێربوونی وانەکانم.

- **باوکت خوێندەواری هەبوو.؟**

- بەڵێ.

- **چۆن فێری خوێندەواری بووبوو، ئایا لە سەردەمی منالّی ئەودا قوتابخانە لە گوندەکەتان هەبووە.؟**

- نا، بەدڵنیایەوە ئەوکاتەی باوکم منالّ بووە قوتابخانە نەبووە، ئیتر نازانم لە کەلار خوێندبووی یان چۆن فێر بووبوو، بەلام دەزانم خوێندەوار بوو.

- **هیچ کات لێت نەپرسی، یان دواتر لە مامەکانت نەپرسیووە لە چییەوە فێر بوو بوو.؟**

- نەخێر.

- **باوکت کاری چی دەکرد.؟**

- فەلاح بوو.

- **بژێوی ژیانتان لەسەر چی بوو؟**

- لە ئاوایی خەریکی فەلاحەت بووین و ماوەیەکیش بارمان کردووە بۆ کەلار وابزانم باوکم لەوێ کاری کردووە تا ئەوکاتەی ناوی هاتۆتەوە بۆ سەربازی، ئیتر جارێکیتر گەڕاوەتەوە بۆ ئاوایی. ئەزانم ئەیووت لە شار یان دەبێت ببم بە جاش، من جاشێتی ناکەم، یان دەبێت ببم بە سەرباز و بچم خۆم بەکوشت بدەم، ئەی سبەی کێ ئەم منالانەم بەخێو بکات، ئەم قسانەی باوکمم لە بیرە دوای ئەوەی لە کەلارەوە بارمان کردبۆوە بۆ کوڵەجۆ.

- **کەواتا ئەوکاتەی باسی دەکەیت شەڕی ئێران و عیراق بووە.؟**

- نازانم شەڕی کوێ بووە، چونکە لە راستیدا من لە کۆتاییەکانی ساڵی 1988 بوو یان سەرەتای 1989 لە سەماوە بیستم کە ئێران و عیراق شەڕیان کردبوو.

- **ئەگەر بپرسم هەست ئەکەی لە زاکیرەتدا یەکەم یادەوەری تۆمار بووبێت و بیرت لەچووبێتەوە، چیە؟**

- ئەوەی لە ئەنفالدا روویدا ئەوەی بە چاوی خۆم بینیم و ئەوەی بەسەرخۆمدا هات هەموویم لە بیر ماوەتەوە.

- **مەبەستم لە پێشترە، کاتێ زۆر مناڵ بووی هەستدەکەی چی شتێکی منالیت لە یادە کە ئیتر هیچ شتێکی پێش ئەومت بەبیردا نایات.؟**

- وەلا سەردەمی منالی زۆر شتم لە بیرە. ژیانی ماڵەوەمان، هەڵسوکەتم لەگەڵ باوکم و دایکم و خوشکەکانم، شەڕم لە بیرە کە لە گوندەکەمان حکومەت خەڵکی کوشت، کۆپتەر رەمی دەکرد، سەیارەی مامی دایکمی سوتاند خورشیدی ناوبوو، جارێکی تر سەیارەی عەتای حاجی حمەجان سوتا سەیارەکەیان لە بەرچاومە پیکاب بوو هەلی کۆپتەر سوتاندی، بەڵام ساڵەکانی نازانم تەنها رووداوەکان دێنەوە بەرچاوم.

- **ئەگەر هەندێ باسی ژیانی لادێکەتانم بۆ بکەی دوای ئەوەی ماڵتان لە کەلارەوە گەڕایەوە بۆ کوڵەجۆ، ژیانتان چۆن بوو؟**

- ئەوکاتانەی کە ئیتر من لە بیرمە هەمووی مەرگەسات بوو، ژیانی لادێ وەك مەیدانی شەڕ وابوو. پێشمەرگە دەهاتن بۆ گوندەکەمان شەوێ دەمانەوە، یان تەرەکتەر و سەیارەی ئاواییان دەبرد دەچوون بۆ ناوچەیەکی تر، حکومەت بیزانیایا جەیش و جاشی دەنارده

سەرمان، یان ئەگەر بە شەوان لایتی سەیارە دەرکەوتایا هاتووچۆی بکردایا لە نێوان گوندەکان، حکومەت بە تۆپی دورهاوێژ رەمی دەکرد، بە ڕۆژ هەلیکۆپتەر دەهات و تەقەی لە خەڵك دەکرد. ئیتر بە گشتی ژیان ناخۆش بوو وەك مرۆڤی ئاسایی نەدەژیاین. بە تایبەتیش ئەگەر کەسێك سەربازی هەڵهاتوو بوایا ئیتر ژیانت نەبوو. من باوکم سەربازی فیرار بوو، کە ناوی هاتبۆوە بۆ سەربازی هەر نەچوو بوو بۆ عەسکەری، یەعنی قاچاغ بوو لە حکومەت. بەو هۆیەوە بەردەوام ئێمە لە ترس و دڵەراوکێدا دەژیاین. من هەرچەندە منالّ بووم هەندێ مەترسی هەبوو هەستم پێناکرد، بەڵام کە گەورەبووم بیرم لەو شتانە دەکردەوە ئەوکات لە مەترسیەکان دەگەیشتم. بیرمە کاتێ دەنگۆی ئەوە هەبوایا کە جەیش و جاش دێنە ناوچەکە گەنجەکان و ئەوانەی سەربازی هەڵاتوو بوون لە ترسا گوندەکەیان چۆڵ دەکرد دەچوونە ئەو چەم و هەڵەتانە شوێنی تایبەتیان دروستکردبوو بۆ خۆحەشاردان، هەموو جار لەگەڵ باوکم دەچووم و وەکوو ئەوان خۆم دەشاردەوە، دەمبینی هاوڕێکانی باوکم پێیان ناخۆش بوو من لەگەڵیان دەچووم، دەیانووت ئەم منالّە چیە لەگەڵ خۆت دەیهێنێ فیشەکێ بتەقێ لە ترسا ئاشکرامان دەکات. ئەوان دەترسان کە ئەگەر من لەگەڵیان بم و جەیش و جاش نزیکبێتەوە من بترسم و بەو هۆیەوە ئەوان ئاشکرابن. بەڵام لەبەر ئەوەی من زۆر زۆر هۆگری باوکم بووم وە ئەویش بەو جۆرە هۆگری

من بوو بۆیە گوێی بە بۆڵەبۆڵی هاوڕێکانی نادا و بەردەوام لەگەڵی بووم، نەك هەر بە ڕۆژ ئەگەر نیوەشەویش بەلایەکدا بچوایا منی لەگەڵ خۆی دەبرد، زۆری خۆش دەویستم و ئەوەنە هۆگری یەکتریی بووین وەك هاوڕێمان لێهاتبوو بەردەوام پێکەوە بووین. کاتێ خەریکی فەلاحەت و مەڕداریش بوو هەر لەگەڵی بووم، کە دەچوو بۆ گوندەکانی تر بۆ سەردانی، بۆ شین و شایی هەمیشە ئەم (تەیمورە) دەستی لە دەستی باوکیا بوو.

بەڕاستی ئەگەر ئەو زەحمەت و مەترسیانەی نەبوایا، ئەو ژیانە بۆ من خۆش بوو هەستم بە خۆشەویستی باوکم دەکرد، دایکم و خوشکەکانم، وا هەست دەکەم ئێمە خێزانێکی بەختەوەر بووین، لە ناو ئەو تۆپ و تەیارە و بەردەوام راکەڕاکەشدا سۆز و خۆشەویستیەك پێکەوەی بەستبووین کە مەترسیشمان لەسەر بوو چونکە پێکەوە بووین جۆرێك هەستمان بەخۆشی دەکرد، یان لانی کەم ئازارەکەی بۆ ئێمە کەمتر بوو چونکە هەمیشە پێکەوە بووین، تەنها کاتێ باوکم ماڵی جێدەهێشت کە مەترسی ئەوە هەبوایا جەیش و جاش دەدەنە سەر گوندەکەیا، یان کۆپتەر رەمی بکردایا. بەڵام لە هەموو ئەوکاتانەشدا من هەر لەگەڵی بووم، بۆیە ئەڵێم مرۆڤ کاتێ ئازارێك دەچێژێت ئەگەر لەگەڵ خۆشەویستەکانیا بێت ئازاری کەمترە، رێك ئەوە بۆ ئێمە وابوو. ژیانی لادێ پڕبوو لە مەترسی و چەرمەسەری، بەڵام یان ئەوەتا بووە بە بەشێك لە رابردوو یان هی

ئەوەبوو کە هەمیشە لەگەڵ باوکم بووم و ئێستا لەگەڵیان نیم هەست دەکەم ئازارەکانی ئەوکات و ئێستا جیاوازن. ڕەنگە ئازار هەر یەك شت بێت بەڵام ژینگەی ئازارەکە جیاوازیەکە دروست بکات، ئەوکات لەگەڵ باوکم و دایکم و خوشکەکانم پێکەوە بووین و ئێستا من بەتەنیا مەینەتیەکانی ژیان و ئازاری مەرگی ئەوان دەچێژم. بۆیە لام وایە ئازارەکانی ئێستا بە سوێ ترن لە ئازارەکانی ئەو کاتانە. زۆرجار دەڵێم ناخۆشیش لەگەڵ کەسانێکدا کە خۆشت ویستوون دەبێتە یادگاری خۆش. بیرمە رۆژێك پێشمەرگە لە گوندەکەمان بوو دابەش بووبوونە سەر ماڵاندا، ماڵی ئێمەش دوو پێشمەرگەی لێبوو، لە کاتی نان خواردندا بوو وتیان کۆپتەر هات، ئێمە لە ماڵی خۆمان لە ژێر سەکۆی بەر هەیوانەکەمان باوکم مەلجەئێکی دروستکردبوو بۆ حاڵەتێك ئەگەر لەناکاو بدەنە سەر گوندەکەیا کە نەتوانین لە ئاوایی دەرچێت و جەیش و جاش بێت تا هەر لە ماڵەکەی خۆمان بتوانین خۆمان حەشاردەین، پێشمەرگەکان خۆیان بەست و یەکێکیان لەسەر سەکۆکەی ماڵمانەوە بە چەکی کلاشینکۆف تەقەی لە هەلیکۆپتەرەکە کرد، کۆپتەرەکە سوڕایەوە و ڕووی کردە ماڵی ئێمە، هەموومان ڕامانکردە ناو ئەو مەلجەئەوە، ساروخێکی دا لەماڵمان کومبارێکمان هەبوو پێشتر دایکم شۆردبووی و بەسەر دیواری حەوشەکەوە هەڵیخستبوو ساروخەکە دای لە ناوەڕاستی کومبارەکە و کردیە دووپارچەوە، ئەوکات زۆرم پێناخۆش بوو

چونکە لەو ژورە دامانخستبوو کە میوانمان دەهات لە سەری دادەنیشتن، وا هەسم دەکرد کە ئیتر میوانمان بێت هیچمان نیە رایبخەین و لە سەری دانیشین وام دەزانی ئیتر میوان نایات بۆ ماڵمان، ئەموت ئیتر پێشمەرگە نایەن بۆ ماڵمان و ئەزانن کومبارەکەمان نەماوە بۆیان رابخەین.

ئەوەندەی من بە بیرم بێت زۆرجاریتر بە تۆپ و هەلیکۆپتەر لە گوندەکەمانی داوە، پێش ئەوەی منیش لە دایك بم گوندەکەمان هەر کەوتۆتە بەر تۆپباران، دەڵێن لە سەردەمی شێخ مەحمود و لە شۆرشی ئەیلول شەڕ لە گوندەکەمان بووە و تاڵان کراوین و ئاوایی سوتێنراوە. نازانم بۆچی حکومەت وڕکی دابوو لە گوندەکان و ویستویەتی بەردەوام خەڵکەکەی ئاوارە و دەربەدەر و ماڵ روخاو بن، ئێمە خەڵکی بێ تاوان بووین خەریکی ژیانی ئاسایی خۆمان بووین، خەڵکەکە یان فەلاحەتیان دەکرد یان خەریکی مەڕداری بوون، من ئەوکاتە وام دەزانی حکومەت پێی ناخۆشە مەڕوماڵات بەخێو بکەین و خەریکی کشتوکاڵ بین بۆیە تۆپبارانمان دەکات، تێناگەیشتم بۆچی کاتێ شوانێك دەچێتە لای رانەکەی هەلیکۆپتەر دەیکوژێت، تەرەکتەرێك دەچێت زەوی بکێڵێت تۆپی تێدەگرن. حکومەتێکی سەیر بوو هەر بەزۆر دەیوست هەمووومان بمرین. ئێمەش زۆر رقمان لە حکومەت بوو زۆریش لێی دەترساین، تەنانەت لە بیرمە گەورەکان کاتێ دەچوون بۆ شار ئەگەر منداڵێك بیویستایا

شوێنی بکەوێت بەوە ئەیانترسان ئەیانوت سەیتەرەی حکومەت دەتگرێت، ئەوە ترسناکترین شتێك بوو کە منالّی لادێی پێ بترسێنی.

مەترسیەکە ئەوەندە زۆر بوو هەر ئەوە نەبوو کە ئەگەر نەچین بۆ شار و خۆمان نەخەینە بەردەستی حکومەت ئیتر لە مەترسی دوور بکەوینەوە، چونکە کاتێ گەنجەکانیش کە ناویان دەهاتەوە بچن بۆ سەربازی و ناچوون و لە گوندەکان دەمانەوە، بەوە لە مەترسی رزگاریان نابوو، چونکە بەردەوام لە ترس و دلّەڕاوکێی ئەوەدابوون جەیش و جاش دێت و دەستگیریان دەکات، یان تۆپ و تەیارە دەمانکوژێت. لە مالّەکەی خۆمانیش وەك ئەوە وابوو لەناو شەڕبین.

- **ئێوە لەمالّەوە چەکتان هەبوو.؟**

– بەلّێ.

- **چی جۆرە چەکێک.؟**

– کلاشینکۆف.

- **مالّەکانی تری گوندەکە ئەوانیش چەکیان هەبوو.؟**

– هەمووی نا، بەلاّم ئەوەی کەمێك دەسترۆ بوایا هەیبوو.

- **دەسترۆ مەبەستت چیە، لە کوێ دەستی بڕۆیشتایا.؟**

- دەستڕۆ مەبەستم پارەیە چەك بە پارە بوو، ئەو کاتەش خەڵك ئەوەنە پارەی نەبوو، بۆیە ئەگەر ماڵێك ئیمکانیاتی هەبوایا دەیکڕی.

- **پێشمەرگە هەقی نەبوو بەسەر ئەوەوە کە لە ماڵەوە چەکتان هەبێت.؟**

- نا، ئەوان پێیان خۆش بوو هەموو ماڵێك چەکی هەبێت بۆ ئەوەی ئەگەر کاتێك پێشمەرگەیش لە ناوچەکە نەبێت جەیش و جاش هات، خەڵك خۆی بەرگری لە خۆی بکات.

- **حاڵەتی وا روویداوە جەیش و جاش بێن و بەبێ پێشمەرگە خەڵکەکە بتوانن بەرگری لە خۆتان بکەن.؟**

- لە گوندەکەی ئێمە نەبووە، چونکە ئەوەنە چەکداری تیا نەبووە بیانتوانیایا ئەوە بکەن، هەر چەند ماڵێکی کەم چەکی هەبوو. هەر جارێك خەبەر هەبوایا جاش و جێش دێت گەنجەکان ئاواییان چۆڵدەکرد. جاری وابوو ئەگەر لە گوندەکانی نزیکیشمان شەڕێ شتێ هەبوایا ئێمە هەر پەنامان دەبردە بەر ئەوەی خۆمان بشارینەوە.

لە بیرمە ئێوارانێك لە خۆر ئاوابوونا لای سەرقەڵا شەڕبوو لە نێوان پێشمەرگە و حکومەت، باوکم و خاڵم عوسمان و منیش لەگەڵیان بووم چوینە سەر گردێکی تەنیشت ئاوایی تەماشامان دەکرد بزانین تەقەکان لەکوێوەیە، ئەوکاتەی لەوێوە سەیری بڵاچەو ئاگری گوللە

تۆپەکانمان دەکرد ووتم باوە ئەی ئەگەر ئێستا تۆپێك بێت و بدات لەبەردەم ئێمە با بڕۆینەوە. دیاربوو باوکم هەستی بە ترسەکەی من کرد، یەکەمجار ووتی مەترسە ئەوە بلاچەی هەورە، بەلام راستیەکەی ئەوە بوو کە دەنگ و بلاچەی گوللەتۆپ بوو نەك هەور، تا دەهات زرمەکانیش زیاتر دەبوون و وەك ئەوەی لە دلمی دابێت شتێکی خراپ دەبێت هەر دەمووت با بڕۆینەوە، بۆیە لەگەڵ باوکم و خالم گەراینەوە بۆ ماڵ. من هەر ئەترسام و خەوم لێناکەوت باوکم ئەیزانی دەترسم منی کردە باوەشی خۆی ووتی پێکەوە دەخەوین، بۆ ئەوەی بوو ترسەکەم برەوێتەوە، باوکم خەوی لێکەوت و من لە باوەشیا هەر بەخەبەر بووم. زرمەیەکی زۆر گەورە هات هەمویان لە خەو راپەڕین باوکم دەرگاکەی کردەوە گڕی تۆپێك دیاربوو دای لەسەر کەلی ئەو گردەی ئێمە ئێوارە لەوێوە تەماشامان دەکرد، دیاربوو باوکم دەیزانی زۆر دەترسم بەوە دلمی دەدایەوە ئەیووت باش بوو ئێوارە بەقسەی تەیمورمان کرد هاتینەوە وانەبوایا تۆپەکە لە ئێمەی ئەدا، ئەم قسانەی بەشێوەیەك دەکرد وەك جۆرێك لە ئازایەتی من نیشان بدات، بۆ ئەوە بەو جۆرە قسەی دەکرد کە من نەترسم. زرمەیەکی تر هات بە پەلە خۆمان کردە ناو مەلجەئەکەوە کە باوکم لە ژێر سەکۆی بەر هەیوانەکەمان دروستی کردبوو. کاتێ چوینە ناو مەلجەئەکەوە ئەرزەکەی هەمووی تەڕبوو باران دەباری ئاوەکە چووبووە ناوێوە، وادەزانم ئێستایە ئاوا لە بەرچاومە دایکم

چارۆکەیەک کای هێنا بە ناو مەلجەئەکەیا بڵاویان کردەوەو ئێمە لەسەر کایەکە دانیشتین. ئەو زرمەیە تۆپێك بوو دابووی لە ماڵی رۆستەمی حاجی حەمەجان ژنەکەی و دوو منداڵی کوشت و منداڵێکی تریانی بریندار کرد، ترسی ئەو رۆژە وەك موچرکێك ئێستاش بەگیانما دێت. دەزانم ئەو شەوە کەس نەخەوت تا دەمەو بەیان شیوەن بوو لە گوندەکەمان و بەیانی پێش خۆرکەوتن چوون قەبریان هەڵکەند و شەهیدەکانیان ناشت و لە ترسا ئەو رۆژە گوندەکەمان چۆڵکرد رامانکرد بۆ هەردەکان و گوندەکانی نزیك، ئەترساین حکومەت پەلامارمان بدات، بەڵام ئەو جارە پەلامارمانی نەدا. ئەوانەم هەموو لە بیرەو دیمەنەکانی بەردەوام لە بەرچاومن.

- **هیچ جارێک بووە بەهۆی رووداوێکەوە لە گوندەکە یان لە ناوچەکانی نزیکتان، بەهۆی شەڕو مەترسی هێرشی جاش و جەیش، هەموو خەڵکی گوندەکە پێکەوە راتان کردبێت.؟**

– بەڵێ زۆرجار خەڵکی ئاوایی هەموو رامانکردووە و گوندەکەمان چۆڵکردووە تا مەترسیەکە لەسەرمان لاچووە و دواتر گەڕاوینەتەوە بۆ ئاوایی.

- **لە حاڵەتێکی وادا خەڵکەکە بۆ کوێ دەچوون.؟**

- نەك ئەمە هەر لە گوندەکەی ئێمە روویدابێت، لە گوندەکانی تریش وابوو کە هەواڵێك هەبوایا پەلامار دەدرێن هەموو ئاوابیەکە چۆڵی دەکرد، یان دەچوونە گوندەکانی تری نزیك یان لەو چەم و هەڵەتانە خۆیان حەشار دەدا تا جەیش و جاشەکە دەگەڕانەوە بۆ شار، ئەو کاتە خەڵکەکەیش دەگەڕانەوە بۆ گوندەکە. جاری وابووە کاتێ حکومەت پەلاماری گوندێکی داوە پێشتر خەڵکی گوندەکە هەموویان لە ترسا رۆیشتوون، جەیش و جاش تاڵانی گوندەکەیان کردووە و ئەوەی بەردەستیان کەوتووە بردویانە، تەنانەت زۆرجار ئاگریان بە ماڵەکانەوە دەنا و دەیان سوتاند. بەڵام خەڵکی گوندەکان ماڵ و کەلوپەلی بەلاوە گرنگ نەبوو، مەترسیەکە ئەوەندە زۆر بوو گرنگ ئەوەبوو خەڵکەکە رزگاری بێت، جەیش و جاشەکەش فێری تاڵان و برۆ بووبوون کە دەچوونە هەر ناوچەیەك لە پێشدا پەلاماری مەڕوماڵات و سەروەت و سامانی خەڵکیان دەدا، بۆیە زۆرجار بەهۆی تاڵانیەوە هاوڵاتیەکان سەلامەت دەردەچوون، چونکە سوپاو جاشەکان تاڵانی خۆیان دەست دەکەوت و دەگەڕانەوە، ئەوان بەو جۆرە دەیانویست کەس نەتوانێ لە گوندەکان بژێت و هەمووی ناچاربێت بچێتەوە لەژێر دەستی خۆیاندابێت. خەڵکەکەیش لەگەڵ ئەوە راهاتبوون، زوو زوو سەر لەنوێ ماڵیان دروست دەکردەوە و دەستیان بە ژیان دەکردەوە.

- **ئەی ئەو کاتانەی کە ئیتر تەواو هەستتان کرد پەلاماری سوپا بۆ سەر ناوچەکەتان دەستپێکرد، خەڵکەکە بڕیاری چیاندا.؟**

– ئێمە لەبەر ئەوەی بەردەوام لەو حاڵەدا دەژیاین، هەستی ئەوەمان لا دروست نەبوو کە ئەم پەلامارە جیاوازە لەوانی تر، بۆیە هەروەك راهاتن خەڵکەکە بەو جۆرە راهاتبوون کە جەیش دێت دەبێت ئێمە رابکەین بۆ هەردەو هەڵەت و گوندەکانی تر و کاتێ سوپاکە دەگەڕێتەوە ئێمەش دەچینەوە شوێنی خۆمان.

- **کەواتا ئاگاداری ئەوە نەبوون کە لە ناوچەکانی تر چی روویدابوو.؟**

– نە لە ماڵی خۆمان و نە لە هیچ کەسێکەوە هیچ شتێکی وام نەبیست کە باسی ئەوە بکرێت لە فلانە ناوچە ئەوە روویداوە. لە لادێ کارەبا نەبوو، تەلەفزیۆن نەبوو، دونیا وەك ئێستا نەبوو، ئێستا نەك هەموو ماڵێك دەچیتە هەر ماڵێك هەموو ژورێك تەلەفزیۆنی تیایە، ئەوکاتە لە گوندێکیشدا ئەگەر هەبووبێت چەند ماڵێك رادیۆیان هەبوو، رادیۆش تەنها ئیزگەکەی یەکێتیی بوو باسی بکردایا ئەویش بەردەوام تەشویش لەسەری بوو، بەهەزار حاڵ لێی تێدەگەیشتی، کە پەلاماری هەر ناوچەیەکیش بدرایا بە جۆرێکی وا باسی ناکرد خەڵکەکە بترسێنێ ئەو زیاتر ئەگەر چالاکی پێشمەرگە هەبوایا ئەوەی باس دەکرد، بۆیە خەڵکی لادێکان ئەو باوەڕەیان هەبوو کە حکومەت پەلاماری هەر ناوچەیەکیش بدات لە ترسی پێشمەرگە زۆر

نامێنێتەوە و دەبێ بگەڕێتەوە بۆ شارەکان، کە جەیش و جاش دەهات دەمانزانی چەند سەعاتێکە و دەڕواتەوە بۆیە وا راهاتبووین هەرکات بزانین جەیش دێت خۆمان حەشاربدەین تا دەچێتەوە. چونکە جەیش و جاش بە رۆژ دەهاتن و بەر لە خۆرئاوابوون رایاندەکردەوە بۆ شارەکان. بەڵام ماوەیەك پێش ئەوەی بەیەکجاری بەو دەردەبچین لەناو خەڵکی ئاوایی باسی ئەوە دەکرا کە ئەگەر کۆپتەر و تەیارە کیمیایی تەقاند، بە پەلە یان بچینە سەر گردە بەرزەکان ئاگر بکەنەوە، یان خوێ بکەنە ناو پەڕۆ و بیگرنە دەمتانەوە.

- **کێ ئەمەی پێ وتن کە ئەگەر کیمیایی تەقی بچنە سەر گردەکان و پەڕۆی تەڕ بگرنە دەمتانەوە.؟**

– هەر لەناو خەڵکی ئاوایدا باس دەکرا.

- **ئەوەندەی پێشمەرگە دەهاتنە گوندەکەتان هیچ رێنماییەکیان پێتان نەدا بۆ چۆنێتی خۆپاراستن لە حاڵەتێکدا بەر چەکی کیمیایی دران.؟**

– نەخێر هەر قسەی ناو خەڵك بوو هیچ کەسێك رێنمایی نەکردین، هەرچەندە ئەگەر پێشمەرگە وایان بووتایا خەڵکەکە بە یەکجاری ئەتۆقین لە ترسا.

- **ئەی دوای ئەوەی زانیتان حکومەت بە کیمیایی لە هەڵەبجەی داوە؟**

– نازانم ناوی هەڵەبجەم نەبیستبوو، تەنها دەوترا حکومەت بە کیمیایی لە خەڵکی مەدەنی داوە و دنیایەك خەڵکی کوشتووە، ئیتر چەند ساڵێك دوای ئەوە بیستم کە بە کیمایی لە هەڵەبجە دراوە، وابزانم لە سەماوە بوو یان لە گوندی ئالعێشم بوو ئەوەم بیست.

- **وەك هەستت پێکردبێت دوای ئەوەی هەواڵی ئەوە لەناو خەڵکدا بڵاو بووەوە کە حکومەت بە کیمیایی لێتان دەدات، هەستی خەڵك چۆن بوو، کاتێ پێشتر جەیش و جاش دەهاتنە سەرتان و ئێوەش گوندەکەتان چۆڵ دەکرد بەوە خۆتان لە مردن رزگار دەکرد، ئایا ئیتر هیچ ئومێدێك هەبوو بتوانن لە چەکی کیمیایی خۆتان دەربازکەن.؟**

– ئێمە پێشتریش هەر دەترساین لە حکومەت، بەڵام دوای ئەو دەنگوباسانە ئیتر زۆر زۆر دەترساین، چونکە ئومێدمان نەما بەوەی لە کەلوەز و هەردەو هەڵەتەکان بتوانین خۆمان حەشار بدەین، تاکە رێگا ئەوە بوو یان چاوەڕێی مردن بکەین یان بچین بەرەو شارەکان ئەگەر لە رێگە نەگیراین لە ماڵە خزم و ناسیاو لە شارەکان خۆمان بشارینەوە و ئەگەر کەوتینە ناو سەیتەرەی جاش و جەیشیشەوە بڵێین خۆمان تەسلیم دەکەینەوە، کە ئەوەشیان کەس نەیدەزانی چیت بەسەر دێت.

- **هیچ خێزانێک هەبوو لەو ڕێگەیە هەڵبژێرێت.؟**

– بەڵێ، بەڵام ئەوەیش هەر ڕێگەیەکی مەترسیدار بوو. لە هەردولا دەبوو بە دزییەوە بڕۆیت، چونکە شۆڕشیش پێی خۆش نەبوو بچین بەرەو شارەکان. ئەگەر کەسێك بیویستایا دەبوو بەدزییەوەو بە شەو بڕۆیشتایا.

- **ئەگەر زانیاریت هەبێت، کەس هەیە بەو جۆرە چوبێتە شارەکان و ڕزگاری بووبێت.؟**

– بەڵێ هەیە، منماڵی مامی خۆم کە لە گوندی درۆزنە بوون بە شەو رایانکرد و چوون بۆ کەلار و لە ئۆردوگای سمود نیشتەجێبوون هەموویان ڕزگاریان بوو، جوابیان بۆ باوکیشم نارد کە بەو جۆرە بڕوات بۆ کەلار بەڵام باوکم رازی نەبوو تەسلیم بێتەوە، چونکە دەیووت یان دەبێ ببمە جاش یان دەبێ ببمە عەسکەر، بڕۆمەوە خوا ئەزانێ حکومەت چی بەسەر ئەم ژن و منالآنەیشا دێنێ. لە گوندەکەی خۆشمان ماڵێك شەوێك ڕۆیشتن و چوونە کەلار و بەر ئەنفال نەکەوتن و ئێستاش ماوون.

- **ئەی کەواتا بۆچی هەموو خەڵکەکە بەو جۆرە هەوڵی خۆ ڕزگارکردنیان نەدا.؟**

- نالێم شۆڕش زۆر پێی خۆش نەبوو خەڵکەکە بەرەو شار بڕوات، ئەگەر کەسێکیش بیویستایا دەبوو بە دزییەوە بڕوات چونکە ڕێگەی چوون بەرەو شارەکانیش بەردەوام مەفرزەی جاشی لێبوو شەوان دەردەچوون بۆ کەمین.

بۆیە زۆر دڵنیاش نەبوویت لەوەی بەو جۆرەش سەلامەت دەبیت، خۆ ئەوجارەی هەموو خەڵکەکە دەستگیرکراو بەو دەردە چووین قسەیەك بڵاو بووەوە کە حکومەت عافواتی داوە و لە ئۆردوگا خانومان دەداتێ، ئەوە بوو هەمووومان پێکەوە چووین هەمووشمانیان گرت، حکومەتەکەش جێی سیقە نەبوو. زۆرێك لە خەڵکەکەیش باوەڕی وابوو کە ئەمجارەش هەروەك جارەکانی پێشووتر لافاوێکە و چی بەرکەوێت رایدەماڵێت و دەڕوات. کاتێك تەواو دڵنیابووین کە هیچ دەروویەك نەماوە بۆ رزگاربوون، تازە حکومەت هەموو ناوچەکەی گرتبوو.

- **ئەوکاتە، خەڵکی گوندەکەتان چی بڕیارێکیاندا.؟**

- دوای ئەوەی کە هەواڵی ئەوەمانزانی کە چواردەوری ناوچەکە بە جەیش هەمووی تەنراوە و لە هەموو لایەکەوە پەلاماری گوندەکان ئەدەن، ئیتر تەواو دڵنیابووین ناتوانین وەك جارەکانی تر روو بکەینە گوندەکانی ناوچەکە و ئەمجارە لەیەك کاتدا حاڵی هەموو گوندەکانی ناوچەکە وەك یەك وایە، بۆیە بیریان لەوە کردەوە کە ڕێگەیەك

بدۆزینەوە بمانگەیەنێتە شار. چونکە کەس نەمابوو بەرگری لە ناوچەکە بکات، حکومەت لەسەر زەوی بە جەیشێکی زۆر لە هەموو شارەکانەوە بەرەو گوندەکان پەلاماری ئەدا و لە ئاسمانیشەوە تەیارەو هەلیکۆپتەر داباریبوون. تاکە رێگەیەك ئەگەر ئومێدی ئەوەی تیابێت رزگارمان بێت ئەوە بوو خۆمان بگەیەنینە ناو شارەکان.

- **چیتانکرد بۆ ئەوەی بگەنە شار، وەك خۆت دەڵێی دوا ئومێدی رزگار بوونتان بوو؟**

– لە رێگەی خزم و ناسیاوەوە قسەیان لەگەڵ مستەشارێك کردبوو کە هاوکاریمان بکات و بە سەلامەتی بمانگەیەنێتە ئۆردوگای (سمود) لە نزیك (کەلار)، خەڵکی ئاوایی ئەوەی بڕیاری دابوو ئەم رێگەیە هەڵبژێرێت بە سێ تەرەکتەر بەرەو (تیلەکۆ) بەرێکەوتین.

- **تەنها خۆتان بوون.؟**

– بەڵێ نەموت لە خەڵکی ئاوایی ئەوەی بڕیاری دابوو تەسلیم بێتەوە.

- **مەبەستم ئەوەبوو کە کەلوپەل هیچتان لەگەڵ خۆتان نەخستە تەرەکتەرەکانەوە.؟**

– با، با، ئەوەی پێویست بوو هەرکەسە و کەلوپەلی خۆی پێبوو.

- **چیتان لە چەکەکان کرد.؟**

– ئەوەی ئێمە باوکم لە ژێر زەوی شاردییەوە، رەنگە خەڵکەکەی تریش ئەوەی چەکی هەبوویێت هەر شاردبێتییەوە، من حەزم دەکرد باوکم تفەنگەکەی پێبوایا هەستم بەوە نەدەکرد چەکمان پێبێت و بچین بۆ شار خراپە، بە باوکمم ووت بۆ تفەنگەکە ناهێنیت، ووتی کورم ئەگەر بگیرێین بە چەکەوە حساب پێشمەرگەمان بۆ دەکەن. کەچی دوای بینیم هیچ جیاوازیەکیان لە نێوان پێشمەرگە و منالّی کۆرپەی سەر بێشکەیش نەکرد.

- **ئەوکاتەی لە گوندەکەی خۆتان کەوتنەرێ کاتەکەی کەی بوو؟**

– نازانم بە دیاریکراوی پێت بڵێم رەنگە سەعات چەند بووبێت، بەلام تاریکە شەو بوو.

- **ئیلەکۆ، چەند دوور بوو لە گوندەکەی خۆتانەوە.؟**

– بە سەیارە هەر دە دەقە بۆ چارەکە رێیەك دەبوو.

- **ئەی ئەو خەڵکەی تری گوندەکە، کە لەگەڵ ئێوە رێگەی شاریان هەڵنەبژارد، بۆ کوێ چوون.؟**

– ئەو کاتەی ئێمە کەوتینەرێ ئەوان هەر لە ئاوایی مانەوە.

- **کەواتا ئەوە دواجار بوو یەکتر بینن و ئیتر لەیەك دابڕان.؟**

- نەخێر هەر ئەو شەوە دوای یەك سەعات بەیەك گەیشتینەوە.

- **ئەوانیش هاتن بۆ تیلەكۆ.؟**

- نا، ئێمە گەڕاینەوە بۆ لای ئەوان.

- **بۆ گەڕانەوە.؟**

- كاتێ نزیك تیلەكۆ بووینەوە جەیشەكە تەڵقە تەنورەیان هەڵدایە ئاسماندا، ئایا لە ترسی خۆیان بوو كاتێ گوێیان لە دەنگی تەرەكتەرەكان بوو، یان لەبەر هەر هۆكارێكی تر بووبێت، بەو هۆیەوە ئێمە تەرەكتەرەكانمان راگرت و كوژاندمانەوە و لە ترسا ووڕتەمان لە خۆمان بڕی. دەترساین جەیش بێت و دەستگیرمان بكات. چەند كەسێكی ئاوایی چوونە ئەو شوێنەی كە مەوعید هەبوو (تایەری مستەشار) بێت و رزگارمان بكات، ماوەیەكی پێچوو گەڕانەوە و ووتیان نەهاتووە، ئیتر نازانم مستەشارەكەش ترسابوو یان راستی لەگەڵ نەكردبووین، بۆیە بە تەرەكتەرەكانەوە گەڕاینەوە بۆ گوندەكەی خۆمان كوڵەجۆ و هەركەس كەلوپەلی خۆی داگرت و چووینەوە ماڵەكانمان.

- **ئەو چوون و گەڕانەوەیەتان زۆری پێچوو؟**

- ڕەنگە هەر سەعاتێکمان پێچووبێت، چونکە تیلەکۆ دوور نەبوو، کاتێکیش دەرچووین بەحساب لەگەڵ مەوعیدی مستەشارەکە نزیك بێت، بۆیە زۆرمان پێنەچوو تا گەڕاینەوە.

- **ئەو شەوە هیچ خەوتن.؟**

- وەلاَیی نازانم بڵێم چی، ترسەکە زۆر بوو، بەلاَم هیلاکیش بووین، بەڵێ خەوتین و بۆ بەیانی نازانم کاتەکەی کەی بوو سواری تەرەکتەرەکان بووینەوە ئەمجارە بەرەو (ملەسورە) کەوتینەڕێ، ئەوێش گوندێکی 30 ماڵی دەبوو، دابەش بووینە سەرماڵەکاندا، دوو ڕۆژ ماینەوە بەلاَم ماڵەکانی گوندەکە ئەرکی زۆر کەوتبووە سەریان، ئێمەش کە هاتین ئەمجارە خەڵکەکە بە سەڵتی هاتبووین، بۆیە بڕیاریاندا جارێکی تر بگەڕێینەوە بۆ (کوڵەجۆ) کەلوپەل و خواردن لەگەڵ خۆمان هەڵگرینەوە. کاتێ گەیشتینەوە گوندەکەی خۆمان دەنگی کۆپتەر و زرمەی تۆپ پەیا بوو، ئیتر تەواو بێ ئومێد بووین و وتمان ئەوە جەیش گەیشتە گوندەکەمان. لە سەربانی هەموو ماڵەکانەوە هەریەکی پەڕۆیەکی سپیمان کردە قامیشێکداو بەرزمان کردەوە وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوەی کە جەیشەکە هات بزانێت ئێمە خەڵکی مەدەنین و تەسلیم دەبین. بەلاَم جەیش و جاش نەهاتن و دوای ماوەیەك چاوەڕوانی، ئەمجارە بۆ دواجار ماڵئاوایمان لە گوندەکەی خۆمان کرد و جارێکیتر بەرەو (ملەسورە) کەوتینەوەڕێ.

- **مەسورە چەند دوور بوو لە کوڵەجۆ، گوندەکەی خۆتانەوە.؟**

– رەنگە نیوو سەعات یان شتێ زیاتر بێت.

- **بەپێ ئەومنە دوور بوو لێتانەوە.؟**

– نا،نا بەسەیارە نیوو سەعات دەبێت. ئێمە لەو دوو سێ رۆژەدا دووجار چووین هەر ئەوەندە دەبوو.

- **کەواتا سوپا نەهاتە سەر گوندەکەی خۆتان؟**

– نەخێر جەیشەکە هەر نەهات و ناچار خۆمان بەرەو پیری چووین.

- **بۆ، کە ئێوە هەر دەتانویست تەسلیم بن ئەگەر هەر لەگوندەکەتان بمانایەتەوە تا سوپا دەهات، ئیتر بۆچی لە ناچاریا خۆتان بەرەو پیری دەچوون.؟**

– ئەزانی رەنگە من ئێستا نەتوانم بە قسە ئەو کەشە ترسناکەت بۆ باس بکەم کە تێی کەوتبووین، وەك ئاخر زەمان وابوو لە هەمووشتێك دەترساین، خۆشمان نەمانئەزانی ئەو رێگەیەی دەیگرینەبەر چیمان بەسەر دێت، نەمانئەزانی لە شوێنی خۆمان بمێنینەوە باشە، یان بچین بۆ گوندەکانی تر، نەمانئەزانی جەیشەکە دەستگیرمانکات یان خۆمان تەسلیم بکەین باشترە. سەرمان لێشێوابوو، ترسەکە ئەوەنە زۆر بوو بە دوای قەرەباڵغی زیاتردا

دەگەڕاین، حەزمان دەکرد زوو بگەینە خەڵکی گوندەکانی تر، وا هەستمان دەکرد تا زۆرترین ترسەکە بەسەرماندا دابەش دەبێت و لە سەرمان کەم دەبێتەوە. لە ناو گوندەکانیشدا ئەو دیعایەیە بڵاو کرابووەوە کە حکومەت عافواتی داوە و هەرکەس خۆی بڕوات تەسلیم بێت حسابی جیاوازە لەوەی جەیش بیگرێت، ئەم قسەیە کەوتبووە ناو هەموو گوندەکانەوە، بۆیە کاتێ چووینەوە بۆ ملەسەورە هەندێ خەڵکی گوندەکانی تریش بەو دیعایەیە هاتبوون. ئەمجارە سێ ڕۆژ لەوێ ماینەوە و لەو سێ ڕۆژەدا دیاربوو لە گوندەکانی تریشەوە خەڵك ڕووی لێرە دەکرد تا دەهات قەرەباڵغ تر دەبوو، وایلێهات بووە شوێنی خڕبوونەوەی بەشێکی زۆری گوندەکانی گەرمیان.

- **ئەو خەڵکە بەهۆی چییەوە ڕووی دەکردە ملەسورە. پێی وابوو لەوێوە ڕزگاری دەبێت، یان چی هۆکارێک هەبوو کە ڕوویکەنە ئەوێ.؟**

– وەڵایی لە ڕاستیا نازانم بۆچی ملەسورەیان هەڵبژاردبوو، ئایا ڕێگەی گوندەکانی بەسەردا دەهات، نزیك بوو لە شارەوە، نازانم هۆکارەکەی چی بوو. بەڵام دەزانم هەمووی هەر لەوێ کۆ دەبووەوە. ئایا خەڵکانێك هەبوون لە گوندەکان هەواڵەکەیان بڵاودەکردەوە کە بچن بۆ ملەسورە، حکومەت خۆی بوو وایکردبوو خەڵکی ناوچەکە

لەوێ کۆبکاتەوە و بە ئاسانی دەستگیریان بکات. نەک ئەوکاتە، ئێستاش نازانم بۆچی لە هەموو لایەکەوە رووومان لەوێ دەکرد.

- **لەناو قسەکانتا ووتت ئەمجارە سێ رۆژ لە ملەسورە ماینەوە، ئەی دوای ئەوەی وا زۆربەی خەڵکی ناوچەکە لەوێ کۆبونەوە، چیتانکرد.؟**

– بەڵێ سێیەم رۆژ بوو لەوێ بووین کاتێکمان زانی جەیش و جاشێکی زۆر لە دوورەوە دیارە بەرەو ملەسورە دێن.

- **ئەوکاتەی باسی دەکەیت کە جەیش و جاش هاتن، کاتەکەی کەی بوو.؟**

– عەسر بوو.

- **خەڵکەکە چیتانکرد، بە هۆی ئەوەی ئەمجارە خەڵکێکی زۆربوون مەترسیەکەتان کەمتر بوو لەوەی کە لە گوندەکەی خۆتان بونایا.؟**

– خۆی لە راستیا مەترسیەکە یەک مەترسی بوو لە هەرکوێ دەستگیر بکرایایت، بەڵام ئێستا چونکە خەڵکێکی زۆر بووین لەرووی نەفسیەوە هەستەکە جیاوازبوو.

- **راستەوخۆ جەیشەکە هاتنە ناو گوندەکەوە، یاخوود لە چواردەوری بڵاوبوونەوە.؟**

- نا، پێش ئەوەی جەیش و جاشەکان نزیك ببنەوە هەندێ لە زەلامەکان بەرەو لایان چوون، لەگەڵ سەرۆك جاشێك قسەیان کردبوو چیمان لێدەکەن.؟ سەرۆك جاشەکە بە زەلامەکانی ووتبوو هیچ مەترسن عافواتە و دەتانبەین لە شار لە موجەمەع داتان دەنێن، خانوتان بۆ دروستکراوە ئاو و کارەباو هەموو شتێکی لێیەو لەوێ نیشتەجێتان دەکەن. کاتێ زەلامەکان بەرەو ملەسورە گەڕانەوە ئەو خەڵکە هەمووی بەرەو پیریان چوون و ژیان و مان و نەمانیان لەسەر ئەوە وەستابوو، هاتنەوەو بە خەڵکەکەیان ووت حکومەت عافواتی داوە خانووی بۆمان دروستکردووە و دەمانبات لە موجەمەع نیشتەجێمان دەکات.

- **کەواتا ئەو زەلامانەی چووبوونە لای سەرۆک جاشەکە، باوەڕیان بە قسەکەی کردبوو.؟**

- بەڵێ ئەوان باوەڕیان کردبوو، کاتێ ئەم هەواڵەشیان ڕاگەیاند خەڵکەکە زۆریان پێخۆش بوو. وەك ئەوەی دەرگای ڕزگارییان لێکرابێتەوە. چونکە پێشتر دەترساین، نەماندەزانی چیمان بەسەردێت. ئەو خەڵکە زۆرە لەوێ کۆبووبوونەوە بەهیوای ئەوەی بەدوای دەروازەیەکدا بگەڕێن کە لە مەترسی لەناوچوون ڕزگارمان بکات. دەترساین کۆپتەر بێت و کیمیایی بکاتە سەرماندا یان جەیشەکە هەر لە دوورەوە بەر تۆپمان بدات، بۆیە هەواڵێکی لەو

جۆره بۆ ئێمه مایەی خۆشبەختی بوو، بەتایبەتیش کە پێشتر ئەوەمان بیستبوو کە حکومەت موجەمەعی دروستکردووە لە شارەکان و هەندێ خەڵك هەبوون کە پێشتر چوبوون و تەسلیم بووبوونەوە بردبویاننە ئەو موجەمەعانە، بۆیە خەڵکەکە زوو باوەڕی کرد. پێشتر پێم ووتی کە من ماڵی مامی خۆم و لە گوندەکەشمان ماڵێکی تر چووبوونەوە بۆ شار و لەو (موجەمەعەکەی سمود) نیشتەجێکرابوون، لە زۆرێك لە گوندەکانی تریش حاڵەتی لەو جۆرە هەبوو، بۆیە ئەوە هۆکارێکی سەرەکی بوو کە باوەڕ بە قسەی سەرۆك جاشەکە بکرێت و وابزانین حکومەت راستمان لەگەڵ دەکات. باوەڕ دەکەیت ئەو خەڵکەی لە ملەسورە کۆبوبوینەوە کاتێك ئەم هەواڵە بەناویاندا بڵاو بوویەوە ئەتووت خەڵاتکراون لە خۆشیا نەیان ئەزانی چی بکەن. ئەوەبوو بە پەلە هەموو ئەو خەڵکەی لەوێ بوون سواری تەرەکتەر و ئۆتۆمبێلەکانی خۆیان بوون کە زۆربەی گوندەکانی ئەوکاتە تەرەکتەریان هەبوو لەبەر خراپی رێگاوبان و کاروباری لادێش بە تەرەکتەر دەکرا نەك بە سەیارە، بۆیە زۆربەی گوندنشینەکان خاوەنی تەرەکتەر بوون و ئەو دەشتە رەشی دەکردەوە لەبەر تەرەکتەر. کاتێك لە ملەسورەوە بەرەو کەلار بەرێکەوتین قافڵەیەکی ئێجگار درێژ بوو، لە بەرچاومە دەتووت بە دوایی سەیارەی بووکەوەن لە رێگە لە خۆشیدا پێشبڕکێیان دەکرد. خۆ ئەگەر خەڵکەکە بیزانیایا حکومەت هەموومان دەگرێت و بەو

دەردەمان دەبات، لە ملەسورە مەجال ئەوە هەبوو رابکەین یان بچین بۆ شوێنێکی تر، بەڵام لە خەیاڵی کەسدا نەبوو کە حکومەت ئەم هەموو ژن و منالە سجن بکات و دواتریش بمانخاتە ژێر خۆڵەوە.

**لە ملەسورە بەرەو کەلار لەگەڵ رەتلی تەرەکتەرەکان سەیارەی جاش و سەربازتان لەگەڵ بوو.؟**

بەڵێ، نەك هەر جاش و جەیش لەگەڵ رەتلی تەرەکتەرەکانی ئێمە بوون، هەموو ناوچەکەش جەیش گرتبووی. دەبابەو مودەرەعە و جەیش و جاشێکی زۆر زۆر بە ناوچەکەدا بڵاوەیان کردبوو، هەلیکۆپتەریش بە ئاسماندا دەهات و دەچوو.

**ئەو سەربازو جاشانەی لەگەڵ رەتلەکەی ئێوەیا بوون، ئەوان چیان پێ بوو.؟**

مەبەستت چیە.؟ چەك و شت دەڵێت.؟

**نا مەبەستم ئەوەیە بە سەیارە بوون یان ئەوانیش سواری تەرەکتەرەکان بوون.؟**

نا، لە ملەسورە لەبەر ئەوەی ئەو خەڵکەی لەوێ کۆبووبۆوە زۆر زۆر بوو، هەبوو تەرەکتەر و سەیارەی پێنەبوو، کاتێ کەوتینەڕێ بەحساب بەرەو موجەمەع، هەندێ لەو خەڵکانەی پیادە بوون خستیانیانە ناو (ئیڤای عەسکەریەوە)، جاش و سەربازەکانیش بە

ئیڤای عەسکەری و لاندکرۆزەر لە پێش و پاشی رەتڵەکەوە بوون و هەموو سەیارە یان تەرەکتەرێکیش سەربازێك یان جاشێکی تیابوو بەدیار خەڵکەکەوە حەرەس بوون.

- **تۆ لە کوێی تەرەکتەرەکەتان سەرکەوتبوویت.؟**

– من لە پێشەوەی تەرەکتەرەکە بووم نەك لەناو عەرەبانەکەی، مامێکم ناوی (عومەر) بوو لێی دەخوڕی من و باوکم و دوو سێ پیاوی تر لە پێشەوە بووین و دایکم و خوشکەکانم و ژمارەیەك لە ئافرەت و مناڵی تری خەڵکی گوندەکەی خۆمان لە عەرەبانەکەی بوون. نەنکیشم هەر لەناو تەرەکتەرەکەی ئێمە بوو، لە تۆپزاوا لەگەڵ پیرەکاندا جیاکرایەوە و برابوونە (نوگرەسەلمان) دوای چەند مانگێك ئەو ئازاد کرابوو بەڵام بە هۆی ئەوەی کوڕەکانی هەموو تیاچوون و مەرگەساتی ئەو خەڵکەی بینی بوو، ئەوەندە گریابوو بۆ کوڕەکانی پێش مردنی بە ماوەیەك لە ڕووی دەروونیەوە تێکچوو.

- **تەرەکتەرەکەی ئێوە، جاش یان عەسکەر، پاسەوانتان بوو.؟**

– عەسکەرێکی عەرەب بوو.

- **ئەو لە کوێی تەرەکتەرەکە سەرکەوتبوو.؟**

- له دوواوه، پشتی دابووه سەر چەنچی تەرەکتەرەکە و پێیەکی لەناو بۆدیەکەی و پێیەکی لەسەر دەرگاکەی بوو، تفەنگەکەشی بە قایشێك کردبوویە ملی و بە دەستیەوە بوو.

- **له ملەسورەوە تا کوێ بە تەرەکتەرەکەی خۆتان چوون.؟**

- تا قۆرەتوو.

- **قۆرەتوو له ملەسورەوە چەند دوور بوو.؟**

- وەڵایی لەڕاستیا بە تەواوی نازانم، بەڵام رەنگە دوو سەعاتمان پێچوبێت.

- **پێشتر ووتت کاتێ جەیش و جاش هاتن بۆ ملەسورە عەسر بوو، ئەی کەی گەیشتنە قۆرەتوو.؟**

- بەڵێ عەسەر بوو جەیشەکە هات، بەڵام تا هەندێ لە زەلامەکان چوونە لایان و گەڕانەوە و خەڵکەکە بەڕێکەوت ماوەیەکی خایاند، نازانم بە دیاریکراوی بڵێم سەعات چەند دەبوو بەڕێکەوتین، بەڵام کاتێ گەیشتینە قۆرەتوو خۆرئاوا بوو بوو.

- **قۆرەتوو، چی بوو ئەگەر بۆم باس بکەیت.؟**

- قۆرەتوو، خۆی وەك بڵێی موجەمەعێکی بچوك یان دێیەکی گەورە بووە، بەڵام حکومەت قەڵایەکی گەورەی سەربازی لێ دروستکردبوو

ئەوکاتە وەك سجن بەکاری هێنا بۆ کۆکردنەوەی ئەو خەڵکەی گەرمیان و لەوێ هێشمانیەوە تا ئەوکاتەی گواستمانیانەوە بۆ تۆپزاوای لای کەرکوك.

- **کاتێ بردتانیان بۆ قۆرەتوو، واتا بۆ سجنکردن، پرسیارتان لە سەرۆك جاشەکە نەکردەوە کە بەو خەڵکەی ووت عافواتە و دەتان بەین بۆ (سمود).؟**

– پێش ئەوەی بگەینە قۆرەتوو، ئەوکاتەی بەڕێگاوە بووین هەرکەسەو لە خەیاڵی ئەوە بووین لە موجەمەع خانومان بدرێتێ و ژیانێکی تازە دەستپێبکەین، بەڵام بینیمان سەر رێگاکان هەمووی گیرابوون، گەیشتبووینە نزیکی (سمود) ژن دەهاتنە سەر رێگاکە و شیوەنیان دەکرد و دەگریان و لە خۆیانیان دەدا، جاش و سەربازەکان فیشەکی گرداریان بەسەر ئەو خەڵکەدا دەتەقاند کە بەرەو ئێمە دەهاتن و لە خۆیانیان دەدا. تا ئەوێ باوەڕمان وابوو کە عافواتەکە راستە و ئۆردوگامان بۆ کراوە، چونکە لە ملەسورە نە ناومانیان نوسی و نە تەفتیشی خەڵکیانکرد و هەر کەسەو بە تەرەکتەر و سەیارەی خۆی کەوتینەڕێ وا دەردەکەوت نیەتیان لەگەڵمان خراپ نەبێت. بەڵام کە لە نزیکی (ئۆردوگای سمود) ئەو دیمەنانەمان بینی ئیتر مقۆمقۆ دروست بوو چیمان لێدەکەن و بۆ کوێمان دەبەن. سەرلەنوێ ترس و دڵەڕاوکێ دایگرتینەوە. بە تایبەتیش کاتێ لە

(سمود) تێپەڕین ئیتر ئومێدمان بەوە نەما کە دەبرێینە موجەمەع، تەواو دڵنیابووین حکومەت نیازی لەگەڵمان خراپە، بەڵام ئەوکاتەش باوەڕناکەم بە خەیاڵی کەسدا هاتبێت بەو دەردەمان دەبەن کە دواتر بینیمان. چونکە خەڵکەکە زۆر زۆر بوون بەشی هەرە زۆریشی ژن و منداڵ بوو، تەسەورمان دەکرد زەلامەکان ئەوانەی سەربازی فیرار بوون دەستگیر بکرێن و بیانکەنە عەسکەر، بەڵام پێمان وانەبوو حکومەت ژن و منداڵ بخاتە زیندانەوە. لەبەر خۆمەوە خەفەتم بۆ ئەوە دەخوارد دەمووت ئێستا دەزانن باوکم سەربازی فیرارەو ئەو دەستگیر دەکەن و لەیەکمان جیا دەکەنەوە، چونکە پێشتر ئەوەندە هۆگری باوکم بووم بۆ من و دەمزانی بۆ ئەویش زۆر قورسە لێك دابڕێن، خۆم دانابوو ئەگەر دەستگیری بکەن ئەوە منیش لەگەڵی دەبم و بە هۆی منەوە بەزەییان بەویشدا دێتەوە و ئازادی دەکەن. ئەشترسام ئەی ئەگەر ئازادی نەکەن و منیش لەگەڵی بگرن، دایکم و خوشکەکانم کێ چاوی لێیان بێت. لەبەر خۆمەوە لەخوا دەپاڕامەوە هەموومان رزگار بکات و پێکەوە بچینەوە لە ئۆردوگای سمود یان لە کەلار بژێین.

تا ئەوکاتەی لە ملەسورە بووین ترسی ئەوەمان هەبوو بکەوینە دەستی جەیش و جاش و بمانکوژن، لەوێ بە نیازی ژیان نەمابووم و هەر لە خۆمەوە دەتووت چاوەڕێی مەرگ دەکەم. بەڵام دوای ئەوەی چوونە لای سەرۆك جاشەکە و پێی وتبوون دەتانبەن بۆ

ئۆردوگا و کاتێ بە تەرەکتەرەکان کەوتینەڕێ، ئیتر هیوام بۆ دروست بووەوە، بیرم لەوە دەکردەوە بچمەوە قوتابخانە و لە شار درێژە بە خوێندن بدەمەوە، دەمووت دەبێ من وەرگرنەوە و لە پۆلی دوو، چونکە ئێستا هاوتەمەنی من پۆلی پێنج و شەش بوون، بەڵام ئەمووت قابیلە حکومەت خۆی حساب بۆ ئەوە نەکات چەند ساڵە قوتابخانە لە گوندەکەمان نەمابوو، دڵی خۆمم دەدایەوە و دەهاتە بەرچاوم بەیانیان دەستی خوشکەکانم دەگرم و دەیانبەم بۆ قوتابخانە. لە دڵی خۆمدا دەمووت خۆ هەلیکۆپتەر لە ئۆردوگا رەمی ناکات و ئیتر تۆپمان تێناگرن، جەیش و جاش نایەنە سەرمان و قوتابخانە داناخرێت لە ترسی شەڕ و شۆڕ. بەڵام کە لە سمود تێپەڕین و شین و رۆڕۆی ئەو ژنانەی سەر رێگاکەم گوێ لێبوو کە بۆ ئێمە دەگریان، ئیتر ئومێدی قوتابخانە و ژیانی ئۆردوگام نەما، هەرچەندە ئێمە هیچیشمان لە بارەی ژیانی ناو ئۆردوگاوە نەدەزانی و هەر لە خۆمەوە ئەو وێنەیەم دروستکردبوو کە ژیان لەوێ خۆشترە و دەچمەوە قوتابخانە. کاتێ لە سمود تێپەڕین بەرەو کەلار و لەوێشەوە بەرەو قۆرەتوو، ئەوەم دەزانی ئۆردوگا هەرچۆنێك بێت لەوە خۆشترە نەزانی بۆ کوێت دەبەن و چیت بەسەر دێت.

لەناو کەلاریش هەمان دیمەنی سمود دووبارە بوویەوە ژن و مناڵ دەهاتنە نزیکی رێگای کاروانی تەرەکتەرەکان و دەگریان، ئیتر بۆ ئێمە مایەی مەترسیەکی گەورە بوو کە دیارە ئەو خەڵکە دەزانن بۆ

کوێمان دەبەن و چیمان بەسەر دێت بۆیە بۆمان دەگرین، بەڵام خۆمان نەماندەزانی چارەنوسمان چی دەبێت.

- **کاتێک گەیشتنە قزلمرتوو، پێش ئێوە هیچ کەسێک لەوێ بوو.؟**

– بەڵێ سەربازی زۆری لێبوو.

- **ئەی خەڵکی هاوشێوەی ئێوە کە لە گوندەکانەوە براینە ئەوێ.؟**

– نەخێر ئەوکاتەی ئێمە گەیشتین کەسی لێنەبوو ئێمە یەکەم وەجبە بووین، کاتێ بردمانیانە نزیك قەڵاکە ئیتر لە سیمای هەموو خەڵکەکەدا ترسێکی زۆرت دەبینی، چونکە ئێمە ئەوە یەکەمجار بوو بینایەی ئاوا گەورە و بەرز ببینین. لە گوندەکانی خۆمان هەموو خانووەکان گڵ بوون و هەمووی چەند ژوورێك و خانووی یەك نهۆمی بوو، مەگەر چۆنها ماڵێك قولەیەك شتێکی لە سەربانەکەی دروست بکردایا، چونکە گڵ بوو بەرگەی ئەوەی نەدەگرت خانوو لەسەر خانوو دروست بکەیت، بەڵام ئەم قەڵایە بینایەکی زۆر زۆر گەورەو بەرز بوو، رەنگە نەك خەڵکی گوندەکانی ئەو ناوچەیە، ئەگەر خانووەکانیشیان بگوێزایەتەوە هەمووی لە ناویا جێی دەبووەوە. دیمەنەکەی هەر لە دوورەوە ترسناك بوو. کاتێ بردمانیانە بەردەمی بینیم دەرگای پێوە نەبوو هەموو تەرەکتەرەکان بە دوای یەکتریدا براینە ناو حەوشەی بیناکەوە، تا ماوەیەکیش گەیشتبووینە ئەوێ

هەموو ئەو خەڵکە حەپەسابووین و هەمووی تەماشای چواردەوری خۆی دەکرد و لە گەورەیی قەڵاکە و بەرزی نهۆمەکانی و بەرفراوانی حەوشەکەیان دەڕوانی. کاتێك ئێمە لە ڕێگە بووین ئەو هەموو تەرەکتەرە بە دوای یەکتریەوە ریز بووبووین دەتووت دەنکی تەزبیحە، زۆر زۆر دیار بووین، بەڵام کە بردمانیانە حەوشەی ئەو قەڵایەی قۆرەتوو لە چاو گەورەیی ئەوێ، ئێمە زۆر کەم بووین و بە هەمووومان بەشێکی بچوکی قەڵاکەمان پڕ دەکردەوە. بە درێژایی ئەو ماوەیەی ئێمە لەوێ ماینەوە بەردەوام هەر خەڵکی تریان بۆ دەهێنا، بەڵام هێشتا قەڵاکە شوێنی چەندین ئاوایی تری تیا دەبووەوە.

- **کاتێک بردتانیانە قەڵاکە تەفتیش کران.؟**

– نا، نایاتە بیرم لەوێ تەفتیش کرابێتین.

- **ماوەی چەنێک ئێوەیان لە قۆرەتوو هێشتەوە.؟**

– وابزانم دە ڕۆژ.

- **ماوەی ئەو دە ڕۆژە چۆن خواردن و ئاویان پێتان ئەدا.؟**

– هیچ خواردنێکیان پێمان نەدا، تەنها بە تەنکەر ئاویان بۆ ئەو خەڵکە دەهێنا.

- **ئەی چۆن ئەو هەموو ژن و منداڵە بەبێ خواردن ماوەی دە رۆژ بەرگەی برسێتیان گرت.؟**

– خەڵکەکە شتومەکی خۆیان پێ بوو چونکە زۆربەی بەو جۆرەی ئێمە گوندەکەی خۆی جێهێشتبوو بەرەو شار ملی رێگەی گرتبووە بەر کەلوپەلی خواردن و هەندێ ئەشیای ناوماڵی لەگەڵ خۆی هێنابوو، ئەوەی لە ئاوایەکان بەجێمان هێشت ئەو شتانە بوون کە نەدەگوازرانەوە بە ئاسانی سنوق و تەختەی نوێن و ناو ماڵ بوو. تەنانەت زۆرێکی مەڕو ماڵاتەکەشی خستبووەڕێ و کاتێ گەیشتبوونە سەر رێگاو جادە سەرەکیەکانی نزیك شار، جاش و جەیشەکە ئیتر مەڕوماڵاتەکانیان تاڵان کردبوون. ئەگەر هەر خێزانێکیش هیچی پێ نەبوایا، لەوێ هاوکاری یەکتریمان دەکرد. لەو دە رۆژەی لە قۆرەتوو بووین هیچ هەستمان بە برسێتی نەکرد بەڵام ئاو کەم بوو، هەرچەندە رۆژانە تەنکەرێکی زۆر ئاویان دەهێنا بەڵام بەشی نەدەکرد، چونکە خەڵکەکە زۆر زۆر بوو رۆژانەش هەر زیادی دەکرد، دونیاش گەرم بوو، قاپ و پێداویستی ئەوەش نەبوو کاتێ ئاو دەهات هەڵیبگرین، بۆیە زۆر بێتاقەتی ئاو بووین.

- **ئەو ماوەیەی لە قۆرەتوو بوون، کێ پاسەوانی دەکردن.؟**

– خۆی مەعەسکەر بوو. هەموو ئەو ناوە سەرباز بوو.

- **سەربازەکان جلەکانیان چۆن بوو.؟**

– بۆرێکی مەیلەو سەوز.

- **ئەو چەکانەی پێیان بوو چی بوو.؟**

– سەربازەکان بەزۆری کلاشینکۆف، هەندێکیش هەبوون دەهاتن وابزانم ناویان دەنوسی یان بەدوای ناوی خەلکدا دەگەڕان، ئەوانە دەمانچە بە قەدیانەوە بوو. لە رێگەش کە هێنامانیان بەرەو قۆرەتوو لە ناو ئیڤاکان و سەیارەی لاندکرۆزەر چەکی بیکەیسیان پێبوو. ئێ دەبابە و مدەڕەعە و تۆپ و تەیارەی دنیای لێبوو.

- **لە قۆرەتوو جاشەکان ناهاتنە ناو ئەو خەلکەی لەوێ کۆکرابوونەوە.؟**

– نەخێر جاش تەنها لە ملەسورە و لە رێگە لەگەلمان بوون تا قۆرەتوو، ئیتر ئێمە جاشمان نەبینیەوە.

- **جۆری پاسەوانێتیکردنتان لەناو قەلاکە چۆن بوو.؟**

– قەلاکە بینایەکی خڕی گەورەبوو دوو قات بوو وەك بازنەیەك وابوو ئەو خەلکە کە دەهاتنە ناوێوە ئیتر رێگەی دەرچوونت نەبوو، سەربازەکانیش بە زۆری لەو شوێنە بوون کە لێوەی دەهاتیە ژورەوە و ئەوان بەردەوام خەلکی تریان دەهێنا و مەگەر بۆ ناونوسین و

لەگەڵ تەنکەرەکان بهاتنایەتە ناو خەڵکەکە، ئەگینا ئەوان لە ئێمەوە دوور بوون.

- **هیچ هەواڵێکی دەرەوەی قەڵاکەتان دەزانی.؟**

– بەڵێ، بەهۆی ئەوەی بەردەوام خەڵکی تریان دەهێناو هەر یەکەو خەڵکی گوندێك و لە ناوچەیەکەوە دەهات بە زوویی هەر هەواڵێك هەبوایا بەناو خەڵکەکەدا بڵاو دەبوەوە. ئاگامان لەوە هەبوو رۆژانە چی رووی دەداو چەند گوندی تری رووخاندووە، من هیچ شارەزایم نەبوو بەڵام گوێم لە باوکم و زەلامەکان دەبوو کە هەواڵی ئەوە دەهات ئەو وەجبەیە خەڵکی فلانە ناوچەن، دەیانووت ئەوە جەیش گەیشتۆتە ئەوێ و ئیتر لەو دە رۆژەدا بەپێی قسەی ئەوان تەواوی ناوچەی گەرمیانی روخاندبوو خەڵکی هەموو گوندەکانی هێنابووە قۆرەتوو.

- **کەس هەوڵی خۆ رزگارکردنی نەدا.؟**

– نازانم، بەڵام ئەگەر یەکێ بیویستایا دەیتوانی رابکات.

- **چۆن دەیتوانی لە کاتێکدا ئەو هەموو پاسەوانەی لێبووە و وەك خۆشت دەڵێی قەڵاکەش تەنیا یەك شوێنی چوونە ژوورەوەی هەبوو.؟**

- من ئەوکات هەستکردنم وەك ئێستا نەبووە نازانم بڵێم چۆن دەیتوانی رابکات، بەڵام لەو دە رۆژەدا چەند جارێك باوکم و خاڵم و هەندێ لە زەلامەکان دەچوونە سەر قەڵاکە. منیش جاری وابوو لەگەڵیان دەچووم لەوێوە تەماشایان دەکرد کە بە لێشاو خەڵکی تریان دەهێنا بەرەو قۆرەتوو لە دوورەوە دیاربوو، رۆژێك گوێم لە باوکم بوو بە خاڵۆمی ووت ئەگەر ئەم ماڵ و منداڵەم لەگەڵ نەبوایا لێرەوە رامدەکرد.

- **کام لە خاڵۆکانت لەگەڵ ئێوە دەستگیر کرابوون.؟**

- خاڵۆ عوسمانم.

- **کەواتا لە سەربانی قەڵاکەوە شوێنێکتان لێوە دەرکەوت کە دەتوانرا لێوەی رابکەن.؟**

- من نازانم ئەو شوێنە کوێ بوو کە باوکم دەیووت لێرەوە رامدەکرد، دەزانم سەربانی قەڵاکە بوو ئیتر نازانم مەبەستی بوو کە لە قەڵاکە خۆی بەربداتە پشتەوە یان شوێنی تری بینی بوو. بەو منداڵییەی خۆمەوە بەزەیم بە باوکمدا دەهاتەوە ئەگەر پێشتر کاتێ لە ئاوایی بووین و ماڵی مامم جوابیان بۆ نارد کە بچێت تەسلیم بێتەوە، لەبەر ئەوەی فیرار بوو دەیووت تەسلیم ببمەوە یان دەبێ ببمە عەسکەر و کەس نەزانێ لە کوێ دەکوژرێم، یان ببمە جاش. هیچیان ناکەم و

لێره دەمێنمەوە خوا گەورەیە، لەوێ ئەوکاتەی دەترساین و نەماندەزانی چیمان بەسەر دێت لەبەر خۆمەوە دەمووت خۆزگە باوکم فێرار نەبوایاو بچوینایەتەوە بۆ شار چونکە هەرچیەکمان بەسەر بێت بەهۆی ئەوەوەیە کە سەربازی فێرارە، بەڵام لێرە لە قۆرەتوو کە گوێم لەو قسەیەی باوکم بوو دەمزانی ئەوە لەبەر من و دایکم و خوشکەکانم بیر لەوە ناکاتەوە خۆی رزگار بکات و دەیەوێ هەموومان پێکەوە بین ئەگەر هەرچیەکمان لێهات. ئەو راستی دەکرد کە دەیووت بڕۆمەوە خوا ئەزانێ حکومەت چی بەسەر ئەم ژن و منالآنەیا دێنێ. دواتر دەمبینی ئەو هەموو ژن و منالە ساواو پیرەمێرد و پیرەژنە چیان بەسەرهات، تێگەیشتم کە هەرچیەك بین لای حکومەت هەر یەك حسابە، ئێمە کوردین و دەبێ بمرین.

- **ئەو دە رۆژەی لە قۆرەتوو بوون، هیچ وەجبەیەک خەڵکیان لای ئێوەوە نەگواستەوە بیانبەن بۆ شوێنێکی تر.؟**

– کە ئێمە براینە ئەوێ یەکەم وەجبە بووین و پێش ئێمە خەلکی تری لێنەبوو، لە دوای ئێمەوە بە درێژایی ئەو دە رۆژە و وەلا بە شەویش هەر خەلکیان دەهێنا، دیاربوو وەك بلێی ئیتر تەواو بەو دە رۆژە هەموو خەلکەکەیان دەستگیرکردووە، رۆژی یانزەیەم کەوتنە گواستنەوەی خەلکەکە، لۆرییەکی زۆریان هێنا (گلابەی مان) هەمووی مەدەنی بوو هێنایان و وا هەست دەکەم بە ناو خوێندنەوە

و شتی وا بوو‌بێت یان وەك بڵێی داوایانکردبێت ئەوانەی پێکەوە گیراوون هەر پێکەوەبن، بەتەواوی نازانم ئەوەیان چۆن بوو، چونکە کاتێ هێنامانیان یەکەمجار ناومانیان نەنوسی ئیتر لەو دە رۆژە دەفتەر بەدەست و دەمانچە بەقەدەکان دەهاتن رەنگە ئەوان ناویان نوسیبێت، کەوتنە خەڵك بارکردن بۆ ناو گەلابەکان، چونکە دەزانم ئێمە کۆکراینەوە ئەوانەی پێشتر لە تەرەکتەرەکە بووین هەموومان پێکەوە بووین و ژمارەیەکی تریش خەڵك تێکەڵ ئێمە کران، دیاربوو گلابەکە زیاتری دەگرت لە تەرەکتەرەکان بۆیە وائەزانم نەفەری چەند تەرەکتەرەێك بووین پێکەوە خراینە یەك گلابەوە.

- **ئەو کاتەی گلابەکانیان هێنا، کەی بوو.؟**

– پێش نیوەرۆ بوو.

- **چۆن خەڵکەکەیان بارکرد.؟**

– کۆمەڵ کۆمەڵ دەکراین و ریزێ گلابە دەهاتن ئەو وەجبەیە تەواو دەبوو پاشان کۆمەڵێکی تر و بەو جۆرە خەڵکەکەیان خستە سەیارەکانەوە.

- **ژمارەی ئەو گلابانەی هێنابوویان بەشی هەموو ئەو خەڵکەی ناو قۆرەتووی دەکرد بۆ گواستنەوەیان.؟**

- نازانم ژمارەی گلاّیەکان چەنێك بوو، وەناشزانم ژمارەی خەڵکەکەش چەند بوو تا بڵێم بەشی دەکرد یان نا. بەلاّم خەڵکەکە زۆر زۆر بوو باوەڕناکەم لەو ڕۆژەدا هەمووی گوێزرابێتەوە، لەوە ئەچوو ئەو ڕۆژە بەشێکی خەڵکەکەیان پێ گوێزرابێتەوە، چونکە دوای ئەوەی ئێمە براینە تۆپزاوا لەوێش دەمانبینی ڕۆژانە خەڵکی تریان دەهێنا، بەوەدا وادەزانم گواستنەوەی ئەو خەڵکەی قۆرەتوو چەند ڕۆژێکی ویستبێت، یان دەبێت شوێنی تریش هەبووبێت وەك قۆرەتوو خەڵکیان لێی کۆکردبێتەوە و لەوکاتەیا ئەوانیشیان گواستبێتەوە بۆ تۆپزاوا.

- **پرۆسەی بارکردنی خەڵکەکە زۆری خایاند.؟**

- ئەگەر مەبەستت یەك لۆری بێت، ڕەنگە چوار بۆ پێنج دەقەیەکی پێچوو بێت، بەلاّم ئەگەر هەموو لۆریەکان بڵێت بەڵێ زۆری پێچوو.

- **چۆن سەریان دەخستن، لۆری لە دوای لۆری پڕ دەکراو دەکەوتەڕێ.؟**

- نا، ئەزانی چۆن بوو چەند لۆریەکیان پێکەوە دەهێنایە حەوشەوە و ئەو خەڵکەی پێشتر کۆمەڵ کۆمەڵ کرابوون دەخرانە ئەو وەجبە گلاّبەیەوە و ئەوان دەچوون لە دەرەوە رادەوەستان و وەجبەیەکی

تر دەهاتە ژوورەوە، بەم شێوەیە کاروانێکی دوورودرێژی گلآبە بەدوای یەکتریەوە راوەستابوون.

- **ئەی ئەو هەموو تەرەکتەرەی پێشتر لە گوندەکان و لە ملەسورەوە پێی هاتبوون بۆ قۆرەتوو، چیان بەسەر هات.؟**

– لە قۆرەتوو هەمویمان بەجێهێشت.

- **خۆتان بەجێتان هێشت.؟**

– ئێمە سجن بووین و هەمومانیان خستە ناو لۆرییەوە بەرەو تۆپزاوا، ئیتر تەرەکتەرەکان لەوێ بەجێمان و بووبوونە دەستکەوتی سوپا.

- **وەک چۆن لە ملەسورەوە هێناتانیان لەناو رەتڵی تەرەکتەرەکانی ئێوە سەرباز و جاش هەبوون، لێرەشەوە جارێکی تر سەرباز و جاشەکان لەگەڵ رەتڵی گلآبەکان پاسەوانیان کردن.**

– نا، ئیتر جاشمان نەبینییەوە، تەنها جەیش پاسەوانی رەتڵەکە بوون. بەلآم پاسەوانی ئەمجارە زۆرتر بوو لەناو قافڵەکە.

- **جگە لەوەی لەگەڵ قافڵەکەتاندا پاسەوانی هەبوون، لەناو گلآبەکە هیچ سەربازێک لەگەڵتان سەرنەکەوت.؟**

– بەڵێ، هەموو لۆریەك سەربازێك لای دەرگاکەی دواوەی بە تفەنگێکەوە راوەستابوو.

- **تفەنگەکەی چۆن گرتبوو، کردبوویە شانی، لەسەر کۆشی بوو، بە دەستییەوە بوو.؟**

— سەربازەکە دانەنیشتبوو تا لەسەر کۆشی دایبنێت، ئەو بە پێوە بوو، زۆر سەیرم پێدەهات هەموویان تفەنگەکانیان وەك یەك گرتبوو، قایشێکی درێژی پێوەبوو کردبویانە ملیان و لە ئاستی ناوکیان گرتبویانە دەستیانەوە، تەنانەت رووی تفەنگەکەشی نەکردبووە دەرەوەی سەیارەکە، رووی لە ئێمە کردبوو.

- **پێشتر هیچ کات سەربازت بەو شێوەیە لە نزیکەوە بینی بوو.؟**

- نەخێر. کاتێ لە ملەسورە بەرێکەوتین بۆ قۆرەتوو سەربازمان زۆر بینی، بەڵام ئاوا نزیك نەبوون لێمەوە، لەناو تەرەکتەرەکەش سەربازێکی تیابوو بەڵام ئەو لە دواوەی لای دەرگای تەرەکتەرەکەوە بوو منیش لە پێشەوە بووم، وەك ئێستا نەبوو کە هەمووی دوو سێ مەترێك لە نێوانماندا بوو.

- **لێی دەترسایت.؟**

- بەڵێ زۆریش دەترسام. چونکە من لەوەتەی لە دایك بووبووم لەگەڵ ترسا چاوم کردبۆوە، بە شەو دەترساین و دەمانووت لەناو خەودا جەیش و جاش دێنە سەرمان، بە رۆژ دەترساین و دەمانووت هەلیکۆپتەر دێت و دەمانکوژێت، بەردەوام دەیانووت عەسکەر دێت،

عەسکەری عیراقی لە بەرچاوی ئێمە وەك ئیزرایل وابوو، وامهەستمان دەکرد لە کوێ بگات پێمان ڕۆحمان دەکێشێت، بۆ ئەو خەڵکە هەرواش دەرچوو یەکەمجار بوو بەو جۆرە عەسکەر ببینین و هەموومانیان دەستگیرکرد و بردمانیان و لە بیابانێکی چۆڵ خستمانیانە ژێر خۆڵەوە.

- **هەستت دەکرد ئەو خەڵکەی تریش هەمان ترسی تۆیان هەبوو، یان بە تەنها تۆ بەو جۆرە دەترسایت.؟**

– نازانم زەلامەکان، بەڵام ژن و منداڵەکان لە ترسا خۆمان گرمۆڵە کردبووە یەکتریاو وا هەستمان دەکرد ئەو سەربازە ئێستا پەنجە دەخاتە سەر پەلەپیتکەی تفەنگەکەی و هەموومان دەکوژێت، لە چاوی خەڵکەکەدا هەمان ئەو ترسەم دەبینی کە لە ناخی خۆمدا هەبوو.

- **ئەم سەربازانەی بەرەو تۆپزاوا لەگەڵتان بوون، هەمان ئەو سەربازانە بوون کە لە ملەسورە بۆ قۆرەتوو پاسەوانیان دەکردن.؟**

– وەڵایی زۆر دڵنیا نیم، بەڵام وابزانم ئەمان جلەکانیان بەڵەك بەڵەك بوو، بەڵام ئەمانیش هەر بێرییەکەی سەریان ڕەش بوو.

- **ئەو کەلوپەلانەی پێتان بوو ڕێگەیاندا هیچ شتێک لەگەڵ خۆتان بەرن.؟**

– بەڵێ، بەشێکی ئەوەی کە پێویست بوو لەگەڵ خۆمان بارمانکرد و ئەوەی ترمان لە قۆرەتوو بەجێهێشت، چونکە کاتێ لە ملەسورە کەوتینەڕێ وامان دەزانی بۆ ئۆردوگامان دەبەن بۆیە ئەوەی لە کوڵەجۆوە هێنابوومان هەموییمان هێنا بۆ قۆرەتوو، هەموو ئەو کەلوپەلانەی ناوماڵ و خواردن چیمان پێبوو هەمویمان هێنا، بەڵام ئیتر نەماندەزانی چارەنوسمان چی دەبێت بۆیە جگە خواردن و هەندێ جل و بەرگ و پێویستی بەردەست ئەوانی ترمان لەناو قەڵاکەی قۆرەتوو بەجێهێشت.

لەناو لۆریەکە لە ڕێگەی نێوان قۆرەتوو بەرەو تۆپزاوا، گێلاسی خوشکم تینووی بوو دەستی بردبوو بۆ دەبەیەك نەوت وایزانی بوو ئاوە، نەوتەکەی خواردەوە و ڕشایەوە توشی وەزعێکی زۆر خراپ و ترسناك بوو دەکۆکی و هاواری لەناو زگی دەکرد، نازانم گەیشتبووینە کوێ بەڵام مەعەسکەرێك نزیکی جادەکە بوو باوکم لەتاوا دای لە سەقفی لۆریەکە تا ڕابووەستێ، ئەویش ڕاوەستاو بەو هۆیەوە هەموو ڕەتڵەکە ڕاگیران، باوکم گێلاسی داگرتە خوارەوە بۆ ناو مەعەسکەرەکە وتیان مستەوسەفی لێیە، هەندێ دەرمانیان دابووە گێلاس تا لە مردن ڕزگاری بوو. ئەوکاتەی باوکم دابەزی و

هەتا ئەو ماوەیەی چووە سەربازگەکەو گەڕایەوە بەشێك لە خەڵکەکەی تر لەناو لۆریەکان دابەزینە خوارەوە، دیاربوو ئەو رەتڵی عەسکەریانەی پاسەوانیان دەکرد زۆر ترسابوون و نەیانزانی چی بووە، وا دەبینن هەروا خەڵکە و لە لۆریەکان دادەبەزن، زۆر شپرزە بوون و کردیانە هاتوهاوارێك هەر مەپرسە، بە پەلەو بەپاڵ و لێدان خەڵکەکیان سواری سەیارەکان کردەوە، ئێمە هەموومان دەستگیرکرابووین و بۆ زیندانێکی تر دەگوێزراینەوە ترسەکە ئەوەندە زۆر بوو لەو کاتەیا لەوە دەترسام دەمووت باوکم نەگرن و بڵێن خەتای تۆ بووە ئەم خەڵکە هەمووی دابەزین.

- **ماوەی چەنێك بە ڕێگەوە بوون تا گەیشتن بە تۆپزاوا.؟**

– رەنگە سێ سەعاتمان پێ چووبێت.

- **کەی بوو گەیشتنە تۆپزاوا.؟**

– دوای عەسر بوو ئاوا لە نێوانی عەسر و ئێوارەیا، چونکە خۆر زۆری بە ئاسمانەوە مابوو.

- **دیمەنی تۆپزاوا چۆن بوو دەمەوێ لە چاوی تۆوە ببینم.؟**

– تۆپزاوا جهەنم بوو، سەربازگەیەکی گەورە بوو هەمووی بە تەلەزێ دەوری گیرابوو، ساحەی زۆر گەورە گەورەی تیابوو، لە ناوەوەش کۆمەڵێك قاعەی درێژ درێژ بە ڕیزی یەکترییەوە بوون. هەموو

ساحەکانی لەبەر خەڵك رەشی دەکردەوە ئەوەندە خەڵکی لێبوو. کاتێ ئێمەیان برد هەر لە دەرگاکەی براینە ژورەوە لە گۆڕەپانێکدا لۆریەکانیان بەتاڵ دەکردوو بەخێرایی سەیارەکانیان دەکردە دەرەوە. رەنگە دە بەقەدەر ئەو خەڵکەی قۆرەتوو لە تۆپزاوا خەڵك کۆکرابێتەوە، دەتووت هەموو کورد لێرەیە. نازانم ئەوانەی تر لە کوێوە هێنرابوون بەڵام ئەوکاتەی ئێمەیان برد قافڵەیەك خەڵکی تریان هێنا ئەوان بە سەیارەی 21 نەفەری بوون وەك ئێمە لە لۆریا نەبوون. لە ناوەوەش دنیایەك ژن و منداڵ و گەنج و پیری لێبوو. لە دەلاوە خەریکی تەفتیشکردن و ناونوسکردن و جیاکردنەوەی ئەو خەڵکە بوون لە یەکتری. نەماندەزانی ئەمە چیە روودەدات، وەك رۆژی حەشر وابوو. هەر لەو گۆڕەپانەی ئێمەیان داگرت لە هەمان شوێن خێزانەکانی ئێمەش لە یەکتری جیاکرانەوە.

- **هەروا بە هەرەمەکی کەوتنە ناو خەڵکەکە پیاوەکانیان جیاکردەوە.؟**

– نەخێر، ئەو خەڵکەی کۆمەڵ کۆمەڵ کرابوون، لە ناو هەر کۆمەڵێکدا چەند مێزو کورسیەك دانرابوون بۆ ناو نوسین. ئێمە هەر چەند خێزانێك و لە بەردەم یەکێ لە ناونوسەکاندا ریز دەکراین، لەکاتی ناو نوسینەکاندا بەپێی تەمەن لەیەك جیا دەکرانەوە. پیاوی گەنج بە جیا، ژن و منداڵ بە جیا، پیرەژن و پیرەمێردەکانیش بە جیا و

هەریەکە و بۆ قاعەی تایبەت بە خۆیان دەبران. لەوێ عەسکەری زۆری لێبوو لە دوای ئەوەی ناوەکە دەنوسرا عەسکەرییەکان پەلاماریان دەدایین و هەر کەسە بۆ ئەو ریزەی خۆیان بڕیاریان لێی دابوو. کاتێ ناوی ئێمەیان نوسی و باوکم و خاڵۆم و ئەوانیان خستە ئەو ریزەوە کە بەرەو قاعەی زەلامەکان و من و دایکم و خوشکەکانیشم بەرەو لایەکی تر، نەنکیشم کە زۆر بە تەمەن بوو خستیانە ریزێکی تر کە هەموویان پیرەژن و پیرەمێرد بوون، من دوای باوکم کەوتم و توند دەستیمگرت وەك ئەوەی بمەوێ پێی بڵێم نابێ جێمان بێڵی، عەسکەرەکان پاڵیان پێوەنام تا لەیەکمان دابڕن، زیاتر دەستی باوکم گوشی، باوکم دەستی کرد بە گیرفانیدا تەنها 15 دینارمان هەبوو دایە دەستی من و ووتی کوڕم با ئەم پارەیە لای تۆ بێت. لەوە ئەچوو باوکم باوەڕی وابووبێت بەم لێك جیاکردنەوەیە ئیتر یەکتری نابینینەوە و رەنگە زەلامەکان بەرن بۆ شوێنێ کە ئیتر چاویان بە دونیای رۆشن نەکەوێتەوە. دیاربوو باوەڕی وانەبوو کە حکومەت ژن و منداڵەکانیش دەکوژێت، چونکە ئەوکاتەی 15 دینارەکەی دایە من، ووتی کوڕم با ئەمەتان پێ بێت ئەگەر چوونە ناوشار بۆ پێویستیتان سەرفی بکەن. باوکم ناهەقی نەبوو ئەگەر وابزانێت زەلامەکان دەکوژن، چونکە حکومەتەکە زاڵم بوو، ئەو دیمەنانەی لە تۆپزاوا بینیمان کە وەك ئاژەڵ مامەڵەیان لەگەڵ خەڵکەکە دەکرد، ئەگەر پێشتر ئومێدێك هەبووبێت کە رەنگە دوای

چەند رۆژێك ئازادمان بكەن، لە تۆپزاوا هیچ هیوایەك نەما، بەتایبەتی کە دەمانبینی چۆن خێرا خێرا زەلامیان جیادەکردەوە و بەدەم پاڵ و قۆناغە تفەنگەوە بەرەو ریزێ قاعە دەیانیانبرد، کەس نەبوو ئەو قەناعەتەی نەبوویێت کە هەموو پیاوە گەنجەکان دەکوژن. بەڵام لە عەقڵی کەسیشدا نەبوو کە ئەوەی لەگەڵ ژن و منداڵەکان دەیکەن ئەگەر لە پیاوەکان خراپتریان بەسەر نەهێنن کەمتر نیە. بۆیە دیار بوو باوکیشم ئەو باوەڕەی هەبوو کە ژن و منداڵەکان ئازاد دەکرێن و رەنگە ببرێن لە ئۆردوگاو شارەکان بژین، بۆیە کاتێ پارەکەی دایە دەستم وتی ئەگەر چوونە ناو شار بۆ پێویستیتان سەرفی بکەن. ئەو نەیدەزانی کە ئیتر منداڵەکانی چاویان نەك بە شار و ئاوەدانی، ئیتر زەوی و ئاسمانیش نابیننەوە. سەربازێك زۆر بە رقەوە پەلی منی راکێشا و لە باوکم جیاکراینەوە، بۆ دواجار تەماشای چاوەکانی باوکمم کرد هەستم کرد فرمێسك بەری چاوەکانی گرتووە و دەیەوێ بەسەر سۆزی خۆیدا زاڵبێت و نەگری، بەڵام لە دەم و چاویا هاواری ئازارێکی زۆرم بەدیدی دەکرد. ئەویان خستە سەر ئەو رێچکەیەی کە گەنجەکانی لێوە دەبران بۆ لایەکی تر و منیان خستەوە ناو ژن و منداڵەکان و هاتمەوە تەنیشتی دایکم و توند دەستم گرت بە چمکی کراسەکەی دایکمەوە، تەماشای چاوی دایکمم کرد عەینەن چاوی باوکم ئەویش فرمێسك بەری گرتبوو، لە خوشکەکانم روانی هەستم کرد وەك بڵێی لە ترسا ناوێرن بشگرین هەڵدەلەرزین و لەملاو ئەولای

دایکمەوە خۆیان نوساندبوو بە قاچێوە. ئێمە کە ماڵمان لە لادێ بوو قەل و مریشکمان هەبوو، کاتێ میوانمان لە شارەوە بهاتایا مناڵەکانیان جوجکی مریشکیان نەبینی بوو دەچوون پەلاماریان دەدا بیگرن، جوجکەکان لە ترسا خۆیان دەکردە ژێر باڵی مریشکەکەوە و خۆیان بچوك دەکردەوە و تەماشای مناڵەکانیان دەکرد نەك لەوە زیاتر بۆیان بچن، ئەو ساتە لە تۆپزاوا خوشکەکانم ئاوا دەهاتە بەرچاو خۆیان ئاڵاندبووە قاچی دایکمەوە و چمکی کراس و کەواکەیان لە خۆیان دەئاڵاند و تەماشای سەربازەکانیان دەکرد وایاندەزانی چمکی کەواو کراسەکەی دایکم لە دڵڕەقی و زوڵمی عەسکەرەکان دەیانپارێزێت، دیمەنێکی زۆر ئازار بەخش بوو ئێستاش زۆرجار هەرسێکیان بەو جۆرە دێنەوە بەرچاوم. لەلایەك هەستم بەوە دەکرد کە ئیتر ئامانەتی دایکم و خوشکەکانم لەسەر منە و دەشترسام لەوەی کێ دەڵێت دایکیشم وەك نەنکم لە ئێمە جیاناکەنەوە. هێشتا ئێمە هەر لەناو گوڕەپانەکە بووین و چاومان پێوەبوو کە باوکم لەگەڵ پیاوەکانی تر و کوڕە سەرو 15 ساڵەکان دەبران بەرەو ئەو ریزە قاعەیەی دیاربوو بۆ گەنجەکان تەرخان کرابوو، ئەوان نەگەیشتبوونە ناو قاعەکان ئێمەشیان بەرەو لایەکی تر خستەڕێ و ئیتر چەند جارێك ئاوڕم دەدایەوە بۆ دوواوە و لەناو قەرەباڵغیەکە بۆ دواجار لە دوورەوە باوکم و ئەوانم بینیەوە کە

ئەوانیش بەریان دەکردە دواوەو تەماشای ئێمەیان دەکرد، ئەوە دووا دیمەنەکانی بوو کە بەو جۆرە لەیەك دابڕاین و ئیتر نەمان بینییەوە.

- **جگە لە باوکت کێی تر لەوێ لە ئێوە جیا کرانەوە.؟**

- ئەوانەی لە قۆرەتوەوە هێنرابووین هەموویان بەو شێوەیەی ئێمە لەوێ لەیەکتری جیا کرانەوە.

- **مەبەستم ئەوانەیە کە تۆ دەیانت ناسی، کەس هەبوو لەگەڵ باوکت بە جیا بڕوات و تۆ بیناسیت.؟**

- ئەی چۆن، مامە عومەرم و خاڵۆم عوسمان و هەندێ پیاوی تری گوندەکەی خۆمان تا تۆپزاوا پێکەوە بووین و لەوێ پیاوەکانیان هەموو پێکەوە برد بۆ قاعەی جیاواز و ژن و منداڵەکانیش بۆ قاعەی تر. چوار پێنج خێزانی کوڵەجۆ بەو جۆرە پێکەوە بووین زەلامەکانیان لەگەڵ باوکم بوون و خێزانەکانیش تا ناو گۆڕەبەکۆمەڵەکە هەر پێکەوە بووین و لەگەڵ دایکم مردن. تەنها نەنکم زوبێدە دایکی باوکم ئەو لەگەڵ هیچ لایەکمان نەبوو، لەگەڵ هەندێ بەتەمەنی تر بەرەو قاعەیەکی تر بردیانیان، ئەوان پیرەژن و پیرەمێردەکان برابوون بۆ نوگرەسەلمان و دوای چەند مانگێك ژیانی پڕ لە ئازار و چەرمەسەری و تینوێتیی و برسیکردن ئەوانەیان کە لەژیان مابوونەوە هێنابویانیانەوە بۆ کوردستان و ئازادیان کردبوون.

- **باوکت چی جل و بەرگێکی لەبەر بوو.؟**

– شەرواڵ و مرادخانی و پشتوێنێکی پانی بەستبوو، کڵاو و جامەشی لەسەر بوو.

- **ئەی دایکت.؟**

– ئەویش هەر جلی کوردی کراس و کەواو سەرپۆشێکی سپی بە سەرەوە بوو. خوشکەکانیشم عەزیّ لەبەریان بوو.

- **ئەی خۆت چیت لەبەردابوو.؟**

– خۆشم کراس و شەرواڵێك.

- **ئەو کەلوپەلانەی لە قۆرەتووەوە هێنابووتان، لە تۆپزاوا رێگەیاندا لەگەڵ خۆتان بیبەنە ناو قاعەکانەوە.؟**

– نەخێر، کە لە لۆرییەکە دایانگرتین لەو شوێنەی ناویان نوسین خەڵکەکەیان تەفتیش کرد و ئەوەی لە گیرفان و ناو جل و بەرگەکانیشدا هەر شتێکت پێ بوایا لێتیان دەسەند، هەبوو چەقۆ و نینۆك بڕو تەزبیح و شانەو ئاوینەی پێبوو هەموویان لە خەڵکەکە سەند، هەبوو نیوتاقی عەسکەری لەپشتی بوو دەیانکردەوە، هیچ شتێکیان بەو خەڵکە نەهێشت بە سەڵتی بردیانیانە ناو قاعەکانەوە.

- **ئێوەشیان تەفتیش کرد.؟**

– من نەخێر، وابزانم ژنەکانیشیان تەفتیش نەکرد هەر گیانی پیاوەکان دەگەڕان. چونکە من خۆم نینۆکبڕێك و قەڵماسنگێك و گوللەیە کەلابەردم پێبوو کە کردمانیانە ناو قاعەکانەوە و ئەو کاتەی گووللەبارانیش کراین هەر لە گیرفانم بوو.

- **هەر قاعەیەك چەند کەسیان تێدەکرد، یا بابڵێم قاعەی چەند کەسی دەگرت.؟**

– وەڵا بە ژمارە نازانم بەلام ئەوەندە پڕبوو ڕێگە نەبوو قاچت ڕاکێشی، هەموو کەوتبووە سەریەکدا.

- **ژمارەی قاعەکان زۆر بوون.؟**

– بەڵێ زۆر زۆر بوو، ئێمە پێشتر شتی لەو جۆرەمان نەبینی بوو، غورفەی درێژ درێژ هەر ژورێك جێگەی چەند گوندێکی تیا دەبووەوە. دنیایە قاعەی لەو جۆرە بە تەنیشتی یەکتریەوە دروستکرابوون. لەوە ئەچوو حکومەت پێشتر ئەمانەی بۆ ئەو خەڵکە حازر کردبێت.

- **ئەو قاعەیەی ئێوەیان تێکرد، پێش ئێوە خەڵکی تری تیابوو.؟**

– بەڵێ زۆریش، ئێمەشیان هەر بەپاڵ لەناویا جێکردەوە.

- **هیچ کەسێکی ترت دەناسی کە لەگەڵ ئێوە لەو قاعەیە بوویێت.؟**

- لەناو ئەوانەی پێش ئێمە لە قاعەکە بوون، یان ئەوانەی لەگەڵ خۆمان کراینە ژوورەوە.؟

- **هەر کامیان بێت.؟**

- ئەی چۆن، ئێمە ژمارەیەك خزم و ناسیاوی یەکتری هەر لە کوڵەجۆوە پێکەوە بووین، لە ملەسورەوە بۆ قۆرەتوو لەوێشەوە بۆ تۆپزاوا لەیەك دانەبڕاین، تەنها پیاوەکان و پیرەکانیان لێمان جیاکردەوە، ئێمە ئەوانی تر هەر پێکەوە بووین، بەڵام ئەوانەی پێش ئێمە لە قاعەکە بوون نەیانمان دەناسی.

- **لەناو قاعەکە ناونوس کران.؟**

- نا، پێش ئەوەی بمانخەنە قاعەکەوە جارێکی تر ناوی دایکم و ئێمەیان نوسیەوە وەك ئەوەی بیانەوێ بزانن هەر قاعەی چەند کەسی تیایە. ئیتر لەناو قاعەکە لێمانیان نەپرسییەوە.

- **جیا لەوەی چواردەوری تۆپزاوا پاسەوانی دەکرا، لە قاعەکان پاسەوانتان هەبوو.؟**

- لەناو قاعەکە نەخێر، بەڵام ساحەکان پڕی عەسکەری بوو، لە نزیکی قاعەکانیش لە چواردەوری عەسکەر بە چەکەوە راوەستابوون. من نازانم ئەو قاعانە پێشتر چی بووە یان بۆچی دروستکرابوون بەڵام

پەنجەرەی باریك و دریژ دریژی زۆر بوو لەڕاستی هەر پەنجەرەیەكدا لە دەرەوە عەسكەرێ بە چەكەوە راوەستابوو.

- **سەربازەكانی ئێرە جل و بەرگەكانیان چۆن بوو.؟**

- هەموو رەنگێكی تیابوو، هەبوو بۆر بوو، هەبوو سەوز بوو، هەبوو بەڵەك بەڵەك بوو، من دواتر ئەوانەم زانی كە ئەوە هەندێكی جلی مغاویری و قوات خاسەن و هەندێكی هەر جوندی بوون. بەڵام لە تۆپزاوا هەندێ عەسكەری لێبوو بێریەكانی سەریان سوور بوو، ئەوانەی ملەسورە و قۆرەتوو هەمووی بێری رەش لە سەریان بوو، لێرە لە تۆپزاوا بێریی رەش و بێری سوری لێبوو.

- **ئاو و خواردنی رۆژانەتان چۆن بوو لە تۆپزاوا.؟**

- خۆی ئەگەر لە شوێنێكی وا ئاو و خواردنیش زۆربێت، بەهۆی قەرەباڵغیەكەیەوە هەر بە زەحمەت بەرت دەكەوێت، خواردن و ئاویان پێمان ئەدا بەڵام یان خواردنی ساردەوەبووی بەرماوەی سەربازەكان بوو یان سەموون و ئاوێكی گەرم. بەڵام ئەوەی زۆر ناخۆش و ناڕەحەت بوو چوونە سەرئاو بوو. درەنگ درەنگ دەرگایان دەكردەوە و رێگەیان ئەدا بچینە سەرئاو، تا دەچوویت و دەهاتیتەوە سوكایەتیان پێدەكردین، نەیاندەهێشت تەواو بگەیتە سەرئاوەكە دەیانكردە هات و هاوار بگەڕێنەوە. بەخوا زۆر منالٌ

هەبوو هەر لەناو قاعەکە خۆی پیس دەکرد، بۆن و بەرامێکی ناخۆش وەك ئەوە وابوو لەناو زێرابدا سجن کرابین. لەوە دەچوو ئەوان هەر بە ئارەزوو وایان لەگەڵ ئێمە کردبێت تا زیاتر ئازار بچێژین.

- **لە پەنجەرەکانی قاعەکەوە تەماشای دەرەوەتان دەکرد.؟**

– بەڵێ، زۆربەی کات.

- **چیتان دەبینی.؟**

– جا چیمان نابینی.؟ هەموو ئەوەی لە تۆپزاوا رووی ئەدا بە بەرچاومانەوە بوو، رۆژانە دەمانبینی هەر خەڵکیان ئەهێنا و وەك ئێمە لەیەك جیادەکرانەوە و دەخرانە قاعەکانەوە، دەمانبینی رۆژانە وەجبە وەجبە زەلامە گەنجەکان دەخەنە سەیارەوە و دەیانبەن. چەندینجار چاومان لێبوو کە بە پشتوێن و جامانەکەی خۆیان دەست و چاوی زەلامەکانیان دەبەستەوە و دەیانیانخستە ناو سەیارەی سەرداپۆشراوە و بە دوای یەکتریدا دەڕۆیشتن.

- **دوای ئەوەی باوکتان لێجیاکرایەوە، هیچ جارێك نەتان بینیەوە، بۆ نمونە لەپەنجەرەکەوە بەرچاوت بکەوێتەوە.؟**

– باوکم، نەخێر، هەر ئەوکاتەی لەیەك دابڕاین ئیتر چاومان پێك نەکەوتەوە، بە زۆریش کە لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەم دەکرد هەر بە هیوای ئەوەی جارێکی تر باوکم ببینمەوە، ئەگینا تا

تەماشای دەرەوەمان بکردایا زیاتر خەفەتت دەخوارد. ئەو هەموو خەڵکەت دەبینی بە دەستی عەسکەرەکانەوە چیان پێدەکرا قاژە لەجەرگت هەڵئەسا. بەخوا دەیانجار دەمبینی پیرەمێردیان ئەدایە بەر شەق، دەمبینی پیرەژنیان بەقژ رادەکێشا، پاڵیان بە ژن و منداڵەوە دەنا. لای ئێمە خەڵك تا زیاتر دەچووە ناو ساڵەوە زیاتر رێزی لێدەگیرا، نەك ئێمە کە منداڵ بووین دەمبینی دایکم و باوکیشم شەرمیان لە پیرەمێرد و پیرەژنەکانی ئاوایی دەکرد، بەڵام لە تۆپزاوا ئەدرانە بەر شەق، پیاوی ریش چەرمویم دەبینی دەیانکردە ریشیا رایان دەکێشت، پیرەمێردێکم بینی کەشیدەی حاجی لەسەری بوو گۆچانێك بە دەستێوەبوو پشتی چەما بووەوە ئەوەنە ئەختیار بوو، جوندیەك لەو جل بەڵەك بەڵەکانە گۆچانەکەی لە دەستی سەند و دەیدایە سەر پشتیا ئەختیارەکە بەدەما کەوت زۆر بەزەیم پێیدا ئەهاتەوە، نازانم ئەو عەسکەرانە خەڵکی کوێ بوون و چۆن گەورە کرابوون وا ئاوا زاڵم و دڵ رەق بوون، لەوە ئەچوو خۆیان خوشك و دایك و باوك و باپیریان نەبووبێت.

- **ئەو کاتانەی لە پەنجەرەکەوە تەماشات دەکرد هیچ ناسیارێکت نەبینی، خزمێکی خۆت یان کەسێکی خەڵکی ئاوایی.؟**

– لە پەنجەرەکەوە نەمبینی، بەڵام رۆژێك کە بۆ سەر ئاو دەچووین کورێکم بینی خەڵکی کوڵەجۆ بوو ناوی کاك عەلی بوو، عەلی جیهانیان

پێدەووت ژنێکی هێنابوو خەڵکی کوردستانی ئێران بوو ئەوانیش وەك ئێمە خۆی و خێزانەکەی دەستگیر کرابوون، کە بینیم زۆرم پێخۆش بوو لە خۆشیا دڵم داخورپا، وەك ئەوەی چاوەڕێی هەواڵێکی خۆشی لێبکەم ئاوا لێی چوومە پێشەوەو پێم ووت کاك عەلی باوکمت نەبینیووە، ووتی نەوەڵا. ئیتر نائومێدانە گەڕامەوە، نەچووم میزەکەم بکەم هاتمەوە بۆ ناو قاعەکە بۆ لای دایکم و خوشکەکانم و پێم ووتن کاك عەلیم بینی بەڵام ووتی باوکتم نەبینیووە، هەمووومان پێکەوە دەستمان کرت بە گریان.

- **ماوەی چەند رۆژ لە تۆپزاوا هێڵدرانەوە.؟**

– بە دیاریکراوی نازانم بڵێم چەند رۆژ یان چەند هەفتە بوو، بەڵام وادەزانم زۆر ماینەوە. چونکە ماوەیەك بوو لەو قاعەیە بووین رۆژێك هاتن و کەوتنە ناومان بەشێکی خەڵکەکەیان جیاکردەوە و بردمانیان بۆ ناو قاعەیەکی تر، نازانم هۆکارەکەی چی بوو، بەڵام دەزانم وا لەگەڵ هەندێ لە خەڵکە خزم و ناسیاوەکە دابڕاین و ئێمە بەر ئەوانە کەوتین کە براین بۆ قاعەیەکی تر و تێکەڵ کۆمەڵێك خەڵکی تریان کردین، ماوەیەکیش لەو قاعەیە هێشتمانیانەوە ئەوجا بردمانیان بۆ بیابانەکە.

- **هیچ خزم یانماڵێکی ناسیار لەگەڵ ئێوە گوێزرانەوە بۆ ناو قاعەکەی تر.؟**

- بەڵێ دەزانم دوو پووری خۆم لەگەڵمان بوون یەکیان ناوی (حەمدیە) بوو کچە عازەب بوو، ئەوی تریان ناوی (مەعسومە) بوو خوشکی دایکم بوو 10 منالی هەبوو هەموویان گیرابوون و پێکەوە بووین منالەکانی مالی خۆلۆ عوسمان و ژنێکی تریش نازانم دایکم چۆن دەیناسی دیاربوو خەلکی گوندەکانی دەوروبەرمان بوو لەگەڵ دایکم دەمەتەقەیان بوو ئەویشمان لەگەڵ بوو. منالەکانی مالّ حاجی حەمەجانیشمان لەگەڵ بوو.

- **ئەم قاعەیەش هەر بەهەمان شێوەی قاعەکەی پێشووتر بوو.؟**

- بەڵێ، هەموو قاعەکان وەك یەك وابوون، تەنانەت ئەو ریزە قاعەیەی باوکم و زەلامەکانیشیان بۆ برد. من دواتر چووم تەماشام کرد ئەوانەش هەر لە قاعەکانی ئێمە دەچوو.

- **لێرەش خواردن و ئاو و سەراوکردنتان هەروابوو.**

- بەڵێ هەمان شت بوو. بەڵام یەك شتم بینی جیاواز بوو ئەویش ئەوە بوو ئافرەتێك دوگیان بوو منالی دەبوو لەکاتی منالّ بووندا دوو عەسکەر هاتبوونە ژوورەوە بۆ ناو قاعەکەمان بە لوولەی تفەنگەکەیان کراسی ژنەکەیان هەلئەدایەوە و تەماشای ناو لنگی ژنەکەیان دەکرد و پێی پێدەکەنین و سوکایەتیان پێی دەکرد، کاتێ ژنەکە هاوار هاواری بوو ئەوان پێی پێ دەکەنین. ئەوە زۆر عەیب و

ناخۆش بوو بەلامەوە و دەمبینی دایکم و ژنەکانی تریش هەموو سەری خۆیان داخستبوو هەندێکیان ئەگریان، بەڵام لەوە ئەچوو ئەو عەسکەرانە هیچ شتێك بەلایانەوە عەیب نەبووبێت و رەحمی خوا لە دڵیاندا نەبوو.

- **شێوەی ئەو سەربازانە چۆن بوو لە بەرچاوت.؟**

– وەڵا زۆر ناشرین بوون، رەش بوون ئێمە قەت زەلام ئاوا رەش و پیس و لچ قەوی و ناشرینمان نەبینی بوو. زۆر لە عەسکەرەکانی ملەسورە و قۆرەتوو نابووت تر بوون.

- **تا ئەوکاتەی لە تۆپزاوا گوێزرانەوە، چی شتێکی ترت بینی سەرنجت رابکێشێ.؟**

– هەمووی بۆ ئێمە سەرنج راکێش بوو، هەموو ئەوەی دەمان بینی تازە بوون بەلای ئێمەوە، ئێمە قەت ئەو شتانەمان نەبینیبوو، نەشمان دەزانی حکومەت ئەوەندە زاڵمە، لەوێ بیرم دەکەوتەوە کاتێ لە کوڵەجۆ بووین و ماڵی مامم جوابیان ناردبوو بۆ باوکم تەسلیم ببێتەوە، پێم سەیر بوو باوکم یەکسەری وتی قەت ناچمەوە، بڕۆمەوە خوا ئەزانێ حکومەت چی بەسەر ئەم ژن و منالآنەیا دێنێ. دیاربوو باوکم و ئەوان دەیانزانی حکومەت ئەوەندە دڕندەیە، بەڵام

قەت بەو جۆرە بۆ ئێمەیان باس نەکردبوو، رەنگە لەبەر ئەوەش بووبێت تا ئێمە زیاتر نەترسین.

ئەوەندەی لە تۆپزاوا بووین رۆژ لە دوای رۆژ شتی زیاترمان دەبینی و زۆرتر زوڵمی ئەو حکومەتەمان بۆ دەردەکەوت. زۆرم پێ سەیر بوو بۆچی کورد بەزەیی بەوانا نەهاتەوە و ئەوان بۆچی رەحم لە دڵیانا نەبوو بەرانبەر بە ئێمە، کاتێ هێشتا ماڵمان لە کوڵەجۆ بوو رۆژێك پێشمەرگە نازانم لەکوێوە هەندێ عەسکەریان بەدیل گرتبوو هێنایانە کوڵەجۆ و لەوێوە بردیانیان بۆ سەرەوی خۆیان، عەسکەرەکانیان دابەشکرد بەسەر ماڵەکاندا و خواردنیان داپێیان و رێزی دنیایان لێیان ئەگرد هێشتا خەڵکی ئاوایی بەزەییمان پێیانا ئەهاتەوە ئەمانووت ئەمانە بەدیل گیراون گوناحن و رەنگە بترسێن، کەچی ئەوان بەزەییان بەکەسدا ناهاتەوە.

ئێمە بەشێك لەو منالآنەی کەمێك هەراش بووین بەم دووا دووابیە بە رۆژ دەمانیانبرد ئاودەست و شوێنی چێشتلێنانەکەیان پێمان پاك دەکردەوە، لەبەر ئەوەی هەر دڵم لای باوکم بوو دەمویست ئەگەر بۆ تەنها جارێکیش بووە چاوم پێی بکەوێتەوە، بۆیە زۆر خۆم دەبردە پێشەوە و ئیشم دەکرد و خۆم ئازا پیشان ئەدا لە پاککردنەوەی ئاو دەست و چێشتخانەکە تا بگەمە نزیکی ئەو قاعانەی باوکم و زەلامەکانیان بۆی برد بوو، رۆژێك لەوێ نزیك بوومەوە تەماشام کرد

جل و بەرگێکی زۆر کۆمەڵ کرابووە سەر یەکدا جامانە و شەرواڵ و مراخانی و پشتوێن و ئەوشتانە بوون، لە لایەکی تریشەوە کۆمەڵی سەعاتی دەستیی خرابوونە سەریەك. دیاربوو ئەوە جل و بەرگ و سەعاتی پیاوەکان بوو چونکە ئەوکاتانەی لە پەنجەرەی قاعەکەوە تەماشای دەرەوەمان دەکرد و کە دەمانبینی زەلامەکانیان دەخستە سەیارەوە هەندێجار جلەکانیان لەبەر دادەکەند. ئەمووت ئەگەر ئێستا بهێڵن بچم بەشێنەیی ناو هەموو جل و بەرگ و سەعاتەکان بگەڕێم، کەلپەل و سەعاتەکەی باوکم دەناسمەوە، تەنانەت لەناو کۆمەڵە سەعاتەکەی دانرابوو لەخۆمەوەسەعاتێکم هەڵگرت و کردمە دەستم، سەعاتێك بوو زۆر گەورەبوو ناوەکەی وابزانم شینێکی کاڵ بوو، بەڵام سەیرم کرد ئیشی ناکرد و جامەکەیشی شکابوو، بەڵام هەر دڵم پێی خۆش بوو کە سەعات لە دەستمایە.

کە هەموو ئەو شتانەم بەچاوی خۆم بینی ئەمزانی ئەمە کەلوپەلی زەلامەکانە بەڵام هیچ عەقڵم بۆ ئەوە ناچوو کە خۆیانیان ئاوا بە بەرچاوی خەڵکەوە بردبێت بۆ کوشتن. تەنانەت زۆرجار دەمبینی بە پشتوێن و جامانەکانی خۆیان دەست و چاویان دەبەستن و بەو شێوەیە دەیانخەنە ناو سەیارەوە، بەڵام نەمدەزانی ئەوە نیشانەی ئەوەیە رەمییان دەکەن.

ڕۆژێکی تر کاتێ شوێنی چێشتلێنانەکەیان پێمان پاك دەکردەوە لە قاپێکدا هەندێ شلە و گۆشی تیابوو، عەسکەرێك ئیشارەتی بۆ ئێمە کرد بچینە ئەو دوورە و سیباق بکەین کێ زوو گەیشت بیخوات. هەموو منداڵەکان رامانکرد، من لە هەموویان خێراتر بووم و پێش گشتیان گەیشتمە لای قاپەکە دڵم خۆش بوو کە ئێستا دەیخۆم و خۆزگەم دەخواست ڕێگەیان بدایام بیبەم لەگەڵ دایکم و خوشکەکانم بیخۆم، کاتێ دەستم بۆ قاپە چێشتەکە برد عەسکەرەکە شەقێکی دا لە قاپەکە و هەمووی رشت. نازانم ئەوان بۆ وابوون، لای ئێمە خەڵك ئاوا لە سەگیش ناکات، دیاربوو حسابی ئاژەڵیشیان بۆ ئێمە ناکرد، ئیتر ئەمە حاڵمان بوو تا ئەو ڕۆژەی لە تۆپزاوا گواستمانیانەوە.

- **پێش ئەوەی بتانگوێزنەوە، هیچ جارێکی تر ناوتانیان نەنوسیەوە.؟**

– نەخێر هەر تەنها یەکەم ڕۆژ بوو.

- **کەی گوێزرانەوە.؟**

– بەیانی بوو دوای خۆر کەوتن، کۆمەڵێك سەیارەی سەرداپۆشراو، وەك ئەو سەیارانە وابوون کە دەمانبینی پیاوەکانیان تێدەکرد، هاتنە بەردەم قاعەکەی ئێمە، ڕەنگی سەیارەکان سپی و سەوز بوون.

- **مەبەستت ئەوەیە ڕەنگاو ڕەنگ بوون، سپی و سەوز بەتێکەڵی.؟**

- نا، نا، هەبوو سپی بوو، هەبوو سەوز لە رەنگی عەسکەری بوو. وەکوو ئیسعاف وابوو، هەرچەندە ئەوکاتە من ئیسعافیشم نەبینی بوو، بەڵام ئێستا دەڵێم وەك ئیسعاف وابوو درێژتر و پانتر. ئێمە هیچ کات سەیارەی لەو جۆرەمان نەبینی بوو، رەنگە کەسیش تا ئەوکاتە نەیبینی بێت، تەنانەت من تا ئێستاش نە لە تەلەفزیۆن و نە لە هیچ شوێنێك سەیارەی وام نەبینیووە، تەنانەت لە ئەمریکاش. سەدامیش رووخا کەس هیچ کام لەو سەیارانەی نەبینیەوە، نازانم سەیارەکانیشیان لەناوداوە، ئایا دواجار هەر بە خەڵکەکەوە سەیارەکانیشیان خستە ژێر خۆڵەوە نازانم چیان لەو سەیارانە کرد، بەخوا لەوە ئەچێت سەیارەکانیشیان وەك ئەو خەڵکە بێسەروشوێن کردبێت تا هیچ ئاسەوارێکی ئەو کۆمەڵکوژییە ئاشکرا نەبێت. سەیارەکان لە لاتەنیشتەوە دەرگایەکی هەبوو لە ناوەوەش دەرگایەکی تری وەك سکە دادەخرا. کورسیەکانی بەرەو پشتی یەکتر دادەنیشتن دەبوو پشت بدەین بە یەکترییەوە.

- **چەند سەیارەی لەو جۆرە بوون.؟**

- وەڵامی نازانم، نەمژمارد، بەڵام زۆر بوو.

- **سایەقی سەیارەکان مەدەنی بوون.؟**

- هیچ لە ئێمەوە دیار نەبوو، بەڵام مەدەنی چی، ئەو ناوە هەمووی سەرباز بوو. هەموویان جلی سەوزی بەڵەک بەڵەک، زۆر توندوتۆڵ دیاربوون، دواتریش پێش ئەوەی گوولله‌بارانمان بکەن لە شوێنێك سایەقەکان دابەزین و سەرکەوتنەوە بینیم جلی سەربازی لەبەری بوو.

- **چۆن خرانە ناو سەیارەکانەوە، بەناو خوێندنەوە بوو.؟**

- نا، هەست ناکەم ناومان خوێندرابێتەوە. دەرگایان کردەوە و کۆمەڵ کۆمەڵ دەبراین بۆ بەردەمی سەیارەکە، کە سەیارەیەك پڕ دەکرا ئەو دەچوو لە دوور رادەوەستاو سەیارەیەکی تر پڕ دەکرا. بەو شێوەیە خراینە سەیارەکانەوە. بەتایبەتیش چونکە ئێمە ژن و منداڵ بووین ئەوە نەبوو بڵێی هەر سەیارەی بەدیاریکراوی چەند کەسی دەگرت ئەوەنەیان تێی کردبێت، تا پڕبوو هەر تێیان تەپاند.

- **نازانی مالی ئێوە بەر چەنەم سەیارە کەوتن، یانی پێش ئێوە چەند سەیارە پڕکرابوون و دوای ئێوە خەڵک مابوو بخرێتە سەیارەوە.؟**

- نا بەخوا نازانم چەنەم سەیارە بووین، بەڵام دەزانم پێش ئێمە خەڵك خرانە سەیارەوە و دوای ئێمەش قاعەکە خەڵکی زۆری تیا مابوو.

- **لەناو سەیارەکە ئێوە مالی خۆتان هەموو پێکەوە بوون، خۆت و خوشکەکانت و دایکت.؟**

- بەڵێ، هەر پێکەوە بووین.

- **هیچ کەسێکی ترت دەناسی کە لە سەیارەکە پێکەوەبن.؟**

- بەڵێ، ماڵی پوورم (مەعسومە) خۆی و هەر 10 منالەکەی و پورم (حەمدیە) و، منالەکانی خاڵۆ عوسمانم و لەناو سەیارەکە ژنێکی تر لەگەڵمان بوو ناوی (پیرۆز حەسەن مراوەیس) بوو خەڵکی گوندەکەی خۆمان بوو، مێردەکەی شوانی ماڵی باپیرم بوو ناوی (کاك عوسمان) بوو، نازانم ئەو چۆن و لەکوێ وە کەوتە تەنیشتمان لە سەیارەکە. چونکە لە قاعەکە من ئەوم نەبینی بوو، ئایا هی ئەوەبوو قاعەکە خەڵکی زۆری تیابوو ئێمە نەمان بینی بوو، وا بە سودفە کەوتە ناو سەیارەکەی ئێمەوە، لەبیرمە ئەو ژنە دووگیان بوو لە رێگە لەناو سەیارەکە لە گەرما کەوتبوو دەمی کەفی دەکرد، نازانم دەبورایەوە یان نەخۆش بوو، پوورم دەبەیەکی بچوك ئاوی پێبوو ئێستاش لە بەرچاومە سەرقەباغێك ئاوم کردە دەم ئەو ژنەوە، بە ئاستەم چاوێکی هەڵبڕی و دیاربوو فێنکی بەدەم و گیانیاهات دەزانم دوعایەکی خێری بۆمکرد بەڵام نازانم دوعاکەی چی بوو. ماڵی (حاجی حەمەجان)یشمان لەگەڵ بوو.

- **هیچ کوڕێکی تری هاوتەمەنی تۆ لەناو سەیارەکە هەبوو.؟**

- بەڵێ، کوڕەکانی پورم (سەردار و کەمال و جەمال و شەماڵ) لەگەڵمان بوون کە هاوتەمەنی خۆم بوون لە قوتابخانەش پێکەوەبووین و لە گوندەکەش هەر برادەر بووین، (کەریم و سامان و سیروان) کوڕی خاڵۆ عوسمانم بوون، خەڵکی تریشی هەبوو لە کوڕو لە کچ کە هاوتەمەنی من بوون.

- **نازانی سەیارەکە چەند کەسی تیابوو.؟**

- نا بەخوا، نازانم بڵێم چەند کەسی دەگرت، بەڵام ئەگەر کورسیەکانی شوێنی چەند نەفەر بووبێت ئەوە حسابکە هەر سەیارەی سێ ئەوەندەیان تێکردووە، چونکە ئێمە ژن و مناڵ بووین و وەك ناو قاعەکان هەمووومانیان خستبووە سەریەکدا.

جارێ هەر ماڵی ئێمەو خاڵۆم و ماڵی پورەکانم و ئەو ژنە نزیك بیست کەس بووین، ماڵی (حاجی حەمەجان)یشمان لەگەڵ بوو حەوت مناڵیان پێ بوو. چەند خێزانێکی تریشی تیابوو ئێمە نەیانمان دەناسی، ئەو ژنەش کە ووتم لە قاعەکە لەگەڵ دایکم یەکیان دەناسی و دەمەتەقەیان بوو ئەویش خۆی و مناڵەکانی لەگەڵمان بوون. زۆربووین دوور نیە شەست بۆ حەفتا کەسێك بووبێتین.

- **وەك هەست بکەی منداڵترین کەس لەگەڵتان بووبێت تەمەنی چەنێك دەبوو.؟**

- منالّی تیابوو بە کۆشی دایکییەوە بوو رەنگە هەر سێ مانگ بووبێت.

- **هیچ کچە عازەبێک هەبوو پێشتر لە قاعەکانی تۆپزاوا لەگەڵتان بووبێت و ئێستاش لەناو سەیارەکە هەر پێکەوە بن.؟**

- بەڵێ پوورم حەمدیە کچە عازەب بوو لەگەڵمان بوو، حەپسە پوورزام بوو نیمچە عازەب بوو. ئەو خێزانانەی تریش کچیان لەگەڵ بوو هەر پێکەوە بووین.

- **لەبەر ئەوەی تۆ لەگەڵ ژن و منالەکان بوویت و تاکە شایەتحالی رزگار بووی ناو گۆڕی بەکۆمەڵی ژن و منالە ئەنفالکراوەکانیت بۆیە قسەی تۆ بۆ مێژوو گرنگە دەربارەی چارەنوسی کچە ئەنفالکراوەکانمان، هیچ کات نەتبینی کچی گەنج لە خێزانەکان جیا بکەنەوە.؟**

- ئەو کاتەی لە قاعەکانی تۆپزاوا بووین جارێك لەناو قاعەکە دیعایەیەك بڵاو بووەوە وتیان کچە گەنجەکان جیا دەکەنەوە و گوایە بەریان دەدەن، بەڵام هەر قسەکە بوو لای ئێمە کەسیان جیا نەکردەوە.

- **کێ قسەکەی بۆتان کرد کە کچە گەنجەکان بەردەدەن.؟**

- کەسێك نەهات قسەکە بکات، وابزانم لەو کاتانەی ئافرەتەکان بۆ سەرئاوکردن دەچوون لە ژنی تری قاعەکانی تریان بیستبوو، ئیتر من

نازانم لە قاعەکانی تر ئەوەیان کردبوو یان ئەویش هەر دیعایە بوو، بەڵام قسەکە لەناومانا بەوجۆرە بڵاو بووەوە.

- **ئەو بەیانیەی کە بەرێخران، نانی بەیانیان داپێتان.؟**

– نەخێر، زوو بوو سەیارەکان هاتن، ئەوان بەیانیان زۆر دوای خۆرکەوتن نان و ئاویان پێمان ئەدا.

- **هیچ هەستێکتان لا دروست بوو کە بۆ کوێتان دەبەن.؟**

– وەڵایی لە راستیا ناوەڵا، چونکە ئێمە کە لە ملەسورە بەرێکەوتین بە نیازی ئۆردوگا هاتین کەسمان نەمان دەزانی دەبرێین بۆ قۆرەتوو، کە لە قۆرەتوو گواستمانیانەوە، کەسمان نەماندەزانی دەبرێین بۆ تۆپزاوا. لێرەشەوە مەگەر خواو خۆیان بیانزانیایا، ئێمە لەکوێ بزانین بۆ کوێمان دەبەن. !

- **ئێوە لە ملەسورە بە تەرەکتەری خۆتان هاتن، لە قۆرەتوو بە گلابەی مەدەنی و شۆفێرەکانیان کورد بوون، ئێستا خراونەتە ناو جۆرێک سەیارەوە کە سەرداپۆشراون و هیچ شوێنێکتان لێوە دیار نیە، هەستتان ناکرد دیارە بۆ جێگەیەکی ترسناکتان دەبەن، وا بەو شێوەیە دەگوێزرێنەوە.**

– بە دڵنیاییەوە زۆر دەترساین، دەمانووت رەنگە بۆ شوێنی زۆر خراپترمان بەرن، بەڵام قەت بە خەیاڵماندا نەهات بەو شوێوەیە

دەمانبەن بۆ ناو چاڵەکانی مەرگ. هەر ناو سەیارەکە خۆیشی عەزابی وەك مردن وابوو، زۆر گەرم و تەنگەنەفەس بوو. هیچ شوێنێکمان لێوەدیار نەبوو، جگە لە چوارگۆشەیەکی بچوك کە کەمێك هەوای لێوە دەهات، هیچ نەفەسێکی نەبوو. هەمووومان کەوتبووینە هیلاکەت. لەناو سەیارەکە رەنگە سێ بەشی رێگەکەمان بڕیبێت ئاوا، دوو مناڵ لە گەرما پیشان و مردن. ئەوەندە کەوتبووینە هیلاکەت دایك و کەسوکاری دوو مناڵەکە هەر ئاوا جەنازەی مناڵەکانیان راخست و ئیتر وەك بڵێی هەمووومان چاوەڕێ بووین بەو شێوەیە بمرین، هیچ شیوەن و هاوارێکیان بۆیان نەکرد، دوو مناڵ بوون تەمەنیان لە دەوری هەشت بۆ نۆ ساڵی دەبوو. خەڵکەکە تەنها لە خوا دەپاڕانەوە و هیچی تر. زۆر تینوو برسی بووین، لە ئێوارەوە هیچمان نەخواردبوو، ئەو دەبە بچوکە ئاوەی پورم (مەعسومە)ش پێی بوو هەر زوو تەواو بوو. کەوتبووینە هلاکەتێك مەپرسە. دنیا خۆشی زۆر گەرم بوو، تا دەهات گەرمتریش دەبوو، ناو سەیارەکەیش دەتووت تەنوورە هەڵاوی گەرمی لێهەڵدەسا، بڕوابکە لەتاو گەرماو نەبوونی هەوایەکی پاك هەمومان گێژو و وڕ بووبووین، خوا خوامان بوو لە شوێنێك راوەستێت و ئەگەر دەشمان کوژن یەکجار هەوایەکی پاك هەڵمژین ئیتر با رۆحمان دەرچێت. نازانم گوناحی ئەو هەموو ژن و مناڵە چی بوو وا بەو جۆرە سزامانیان ئەدا.

هەر ڕێگایان بڕی و هەر ناگەیشتین، تەواو کەوتبووینە هیلاکەت و دەیانجار بە دانیشتنەوە دەکەوتینە سەر ئەژنۆی خۆمانداو هەڵدەساینەوە، خۆمان دەنوسان بە سنگی دایکمانەوە و بەرمان ئەدا. لە شوێنێك سەیارەکان راوەستان دەرگای یەکەمی سەیارەکەیان کردەوە بەڵام دەرگاکەی ناوەوە کە وەك سکە وابوو ئەوەیان هەر بەداخراویی لەسەر ئێمە مایەوە، لەو پەنجەرە بچوکەوە کە لەنێوانی دەرگاکەیابوو دەرەوەمان لێوە دەرکەوت، بینیمان ئەو سەربازانەی پاسەوانمان بوون و شۆفێرەکان دابەزین و وەك بڵێی سەربازگە بوو، چوون و پاش کەمێك گەڕانەوە بۆ لای ئێمەو سەیارەکان کەوتنەوەڕێ.

- **پێت وایە شۆفێرو پاسەوانەکانیان گۆڕی و لەبری ئەوان کەسانێکی تر هاتن یان هەر ئەوان بوون هاتنەوە.؟**

— لەبەرچاوی ئێمە هەموویان هەر لەیەك دەچوون، نازانم ئایا شۆفێر و سەربازەکانیان گۆڕی، یان کارێکیان هەبوو چوونە ئەو سەربازگەیەو گەڕانەوە، ئەوەیان نازانم. بەڵام دوای ئەوەی سەیارەکان کەوتنەوەڕێ ماوەیەکی کەم بوو بەڕێوەبووین هەستمانکرد سەیارەکە لە جادەی قیر لایداو کەوتە سەر ڕێگای خۆڵ ئیتر کەوتە هەڵبەزو دابەز دەمانزانی ڕێگاکە خۆڵە. لەدڵ خۆمەوە دەمووت دەی

خوایە کێ دەڵێت ئەوە ڕێگای گوندەکەی خۆمان نیە و دەمانبەنەوە بۆ کوڵەجۆ. وا هەستم دەکرد خەیاڵەکەم ڕاستەو ئێستا دەچینەوە باوکیشم لەوێ چاوەڕێمان دەکات. بەڵام کە تەماشایەکی ناو سەیارەکەم دەکرد و دەمزانی هەندێ لەوانەی لەگەڵمان بوون خەڵکی لای ئێمە نین نائومێد دەبووم و دەمووت بەخوا نامانبەنەوە، چونکە ئەوانە بۆچی بێنن بۆ گوندەکەی ئێمە. ئیتر بەدەم ترس و خەیاڵ و بێ هیوایی و جار جارێك ئومێدەوە نزیکەی نیوو سەعاتێکیش بە ڕێگای خۆڵدا ڕۆیشتن و لە ناکاو ڕاوەستان. هەموومان تەماشای یەکتریمان دەکرد و وەك ئەوەی بەچاو لەیەکتری بپرسین دەبێ چیمان لێبکەن، دوای ماوەیەکی کەم دەرگای سەیارەکەیان کردەوە و ئیشارەتیان کرد دابەزین، ئێمە ناو سەیارەکە ئەوەندە گەرم و تەنگەنەفەس بوو دەمانووت ئەگەر بشمان کوژن بەڵام جارێکیتر بخرێینە دەرەوە و هەوایەکی پاك هەڵمژین شوکرین. بەڵام کە سەیارەکە ڕاوەستاو ئیشارەتیان بۆ کردین دابەزینە خوارەوە دیار بوو هەموومان ئەو ترسەمان هەبوو کە دەبێت چیمان لێبکەن کەس جورئەتی ناکرد دابەزێتە خوارەوە، تا ئەو عەسکەرەی دەرگاکەی لێکردینەوە خۆی کردیە پەلی یەك دووان لەوانەی لای دەرگاکەوە دانیشتبوون و ئیتر هەموومان بە دوای ئەواندا چووینە خوارەوە، ئەو

دوو منداڵەی لە تینواو لە گەرما مردبوون یەکێکیان منداڵی ئەو ژنە بوو کە دایکم دەیناسی و لە قاعەکە دەمەتەقەی لەگەڵ دەکرد دایکەکانیان تەرمی منداڵەکانیان هەڵگرت لەگەڵ خۆیان بیهێننە خوارەوەبەڵام سەربازەکە تەماشای کرد کە مردوون ئیشارەتی بۆ کردن کە جەنازەکانیان لەناو سەیارەکە جێبهێڵن، دابەزین و لەبەردەم سەیارەکە هەموومانیان کۆمەڵ کرد.

- **یەکەم دیمەن بەرچاوت کەوت چی بوو.؟**

– کەی.؟

- **ئەوکاتەی لە سەیارەکە دایانگرتن، ئەو دیمەنەی بینیت چی بوو.؟**

– هەر لەناو دەرگای سەیارەکەوە ئاسمانێکی لێڵ و بیابانێکی چۆڵ و هۆڵ. سەرەتا هەواکەم پێخۆش بوو چونکە ناو سەیارەکە ئەوەندە گەرم بوو ئەو هەوایەی لەناو دەرگاکە بەڕوومدا هات هەوایەکی خۆش و دڵ ئارامکەرەوە بوو، زۆر بە قووڵی هەناسەیەکم هەڵمژی، بەڵام کە دابەزین و تەماشای چواردەوری خۆمانم کرد تەواو ترسام، چونکە هەتا چاو بڕی دەکرد سەحرابوو، خۆڵەکەی ژێر پێمان جیاواز بوو لە خۆڵی لای خۆمان ناچوو، نەرم و وورد بوو هەمووی لم بوو، ئێمە تەنانەت خۆڵی لەو جۆرەشمان نەبینی بوو. کە دایانگرتین و ئەو سەحرا چۆڵەم بینی وا هەستمکرد لێرە بەرەڵامان دەکەن، تەماشای

دایکم و خەڵکەکەی تریشم کرد بینیم هەموویان وەك من لەو بیابانە دەڕوانن، من نازانم ئەوان چۆن بیریان دەکردەوە بەڵام دەڵێم ڕەنگە ئەوانیش هەروەك من باوەڕیان وابوو‌بێت حکومەت ئێمەی هێناوە بۆ ئەو سەحرا چۆڵ و بیابانە و لێرە بەرەڵامان بکەن، دەترسام دەمووت هەر لە تینوا و لەبرسا دەمرین و ڕەنگە هەر دڕندەی کێووی بمانخوات. تێنەدەگەیشتم ئەم حکومەتە بۆچی وامان پێدەکات، چی شتێکمان کردبوو، تاوانمان چی بوو تا لە گوند و ئاوایی خۆمان هەڵی کەندین و بیەوێ لەم سەحرایە بژین. من چووزانم ئێمەی بۆ ژیان نەهێناوە بۆ ئێرەو ئەم بیابانەشمان پێ ڕەوا نابینێت لێی بژین و ئێمەیان هێناوە لێرە بمانکوژن.

- **هەر بەتەنیا سەیارەکەی ئێوە ڕاوەستاو ئێوەیان داگرتە خوارەوە.؟**

– نا، هەموو سەیارەکان.

- **ئەو شوێنە سەربازگە یان هیچ بینایەکی لێبوو.؟**

– نەخێر تا چاو بڕی دەکرد چۆڵەوانی بوو.

- **کاتەکەی کەی بوو وەك بزانی.؟**

– هێشتا خۆرئاوا نەبوو بوو، بەڵام وورده وورده خەریك بوو ئاوا دەبوو.

- **خەڵکەکەیان هەموو تێکەڵ بەیەکتری کردەوە، مەبەستم ئەوەیە نەفەری هەموو سەیارەکانیان پێکەوە لەو سەحرایە کۆکردەوە.؟**

- نا، هەر سەیارەیەك نەفەرەکانیان لە نزیکی دەرگاکەی خۆی کۆمەڵکرد.

- **سەربازی زۆر لە دەورتان بوو.؟**

- ناوەڵا زۆر نەبوون، چونکە ئەو سەحرایە خۆی سەربازی لێنەبوو، تەنها چەند لاندکرۆزەرێك سەرباز هەر لە تۆپزاواوە لەگەڵمان بوون، ئیتر نازانم هەر ئەوانە بوون یان لەو شوێنەی پێشتر گۆڕیبویانیان، بەڵام دابەزین و دەورمانیان گرتبوو. مەتارەیەکی گەورە ئاویان هێناو هەر لە سەرقەپاغی مەتارەکە یەکی قومێك ئاویان داپێمان، هەرچەندە کەم بوو بەڵام لەبەر ئەوەی زۆرمان تینوو بوو ئەو دەم و قورگ تەڕکردنە وەك ئەوە وابوو چاکەیەکی گەورەیان لەگەڵمان کردبێت، ئەو هەموو زوڵم و زۆرەیان بەرانبەرمان کردبوو، ئێمەیان گەیاندبووە ئەو بیابانە ترسناکە و نەماندەزانی دەیانەوێ چیمان لێبکەن و بەرەو کوێمان دەبەن، کەچی ئەوەندە دڵمان ساف بوو دایکم و ژنەکانی تر گوێم لێبوو دوعای خێریان بۆیان دەکرد. نازانم هەر تەبیعەتی ئێمە وابوو کە یەکێ چاکەیەکمان لەگەڵ بکات دوعای خێری بۆ دەکەین، یان ئەوەندە تینوومان بوو بوو لەناو سەیارەکە، ئەو قومە ئاوا بەقەدەر ئەوەی مردوویەك زیندوبکەیتەوە بۆ ئێمە

گەورە بوو. بەڵام ئەوەنەی پێنەچوو کۆمەڵێك پەڕۆی رەشیان هێنا چاوی هەموومانیان بەستەوە مەگەر ئەوانەی زۆر منالّ بوون چاویان نەبەسترابێت، پاش کەمێك سەرمانیان خستەوە ناو سەیارەکان و کەوتنەوە رێ. نەمانزانی بۆچی راوەستان و مەبەستیان چی بوو لەوەی ئاویان پێماندا، کە ئەوان لە بەری بەیانییەوە ئێمەیان خستبووە ناو سەیارەی موقەپەتەوە و بێ نان و بێ ئاو لە بای بەیانیەوە بەرێوەن بەشی ئەوەنە رەحمی خوا لەدڵیان نەبوو لەناو سەیارەکە پەنجەرەیکی تیابکەن هەر هەوا هەڵمژین، ئێستا بۆچی وا دڵیان گۆڕا و ئاومان ئەدەنێ، لەوە ئەچوو هەموو خەڵکەکە هەر بیری لەوە کردبێتەوە و ئومێدی ئەوەی لا دروست بووبێت کێ دەڵێ قەرارێ شتێ دەرنەچووە وا لەگەڵمان گۆڕان. بەڵام لەوەش بە گومان بووین ئەی بۆچی چاومانیان بەستەوە، هەرچەندە ئەگەر کەسێك بیویستایا بە ئاسانی دەیتوانی چاوی خۆی بکاتەوە، دیاربوو ئەوان خۆیان دەیانزانی ئەو خەڵکە پاش کەمێکی تر هەموویان لەناو دەبرێن بۆیە ترسی ئەوەیان نەبووە کەسێك چاوی بکاتەوە.

- **هیچ کەسێک هەبوو چاوی خۆی بکاتەوە.؟**

– بەڵێ من خۆم پەڕۆکەم لەسەر چاوم لابرد.

- **کەسیترت لەبینی بەشێوەی تۆ چاوی خۆی کردبێتەوە.؟**

- نازانم، چونکە ماوەیەکی کەم لە دوای ئەوەی چاویان بەستین سەیارەکان راوەستانەوە، ناو سەیارەکە تاریك بوو بیرم نیە بڵێم کەسێکم بەرچاو کەوت وای کردبێت، یان بۆچی بەخەڵکەکەم نەووت چاوتان بکەنەوە، یان یارمەتیان بدەم، هیچ نەبوایا چاوی دایکم و خوشکەکانی خۆم بکردایەتەوە. نازانم بۆچی لەو کاتەیا ئەو هەستەم نەبووە. دڵنیام هێشتا هیچمان داڵغەکانمان تەواو نەکردبوو بەدەم خەیاڵەوە بووین و رەنگە دە دەقەیەك بووبێت و نەبووبێت جارێکی تر سەیارەکان راوەستان، ئەمجارەش دەرگایان لەسەرمان کردەوە و دایانگرتینە خوارەوە. ئەمجارەیان دوودڵ نەبووین لە دابەزینەکە و وەك ئەوەی هەمووومان هیوایەکمان لا دروست بووبێت نەجاتمان دەبێت، یان دڵنیابووبێتین لەوەی ئەمە کۆتاییمانە، چونکە بەئاسانی هەستاین و بەرەو دەرگاکە چووین، یەکە یەکە دابەزینە خوارەوە، هەر ئەوەندەی پێمانخستە سەرزەوی تێگەیشتم کە ئیتر ئەوە دووا مەنزڵی ئێمەیە.

- **بەچیدا ئەو هەستەت بۆ دروست بوو، یا ئەوەت بۆ دەرکەوت کە ئەوە دووا مەنزڵی ئێوەیە.؟**

- کە دابەزین، بینیم هەر سەیارەیەك و لە دیار چاڵێك راوەستاوە و نەفەرەکان دادەگرنە بەردەم چاڵەکە. ئیتر زانیم ئەو چاڵانەیان بۆ ئێمەیە. هەمووومان حەپەسابووین بێ ئەوەی هیچ کەسێك وورتەیەك

لەدەمی بێتە دەرەوە. خۆم ئێستا کە بیر لەو ساتە دەکەمەوە دەڵێم هیچ بە دووری نازانم ئەو سەرقەباغە ئاوەی دایان پێمان رەنگە دەرمانێکیان تێکردبێت خەڵکەکە وڕو گێژ بکات. یان ئەوەتا هەمووما‌ن تاسابووین لە ترسا، نازانم چی بوو، کەس هیچی بۆ نەدەوترا. ئایا هی ئەوەبوو لە باوەڕی کەسدا نەبوو بەو دەردەمان بەرن و بەو جۆرە بمانکوژن، ئێستاش نازانم هۆی چی بوو کە نە ژنێك نە منداڵێك هاوارێکی نەکرد، بەرەو چاڵەکان پاڵیاننناین و ئێمەش چووینە ناو چاڵەکانەوە.

- **بۆ جاری دووەم کە دایانگرتن دونیا تاریک بوو بوو.؟**

خۆر دیارنەمابوو بەڵام هێشتا تاریك دانەهاتبوو.

- **ئەی ئێستا کەست نەبینی وەک خۆت چاوی کردبێتەوە.؟**

– نازانم، رەنگە خەڵکی تیابووبێت چاوی کردبێتەوە و رونگە لە ترسی عەسکەرەکانیش کەس چاوی نەکردبێتەوە، من لەوکاتەیە تەرکیزم لای ئەوە نەبووە بزانم کەسێکی تر وەك منی کردووە یان نا.

- **کە خەڵکەکە چاویان بەسترابوو چۆن لە سەیارەکەوە چوون بۆ ناو چاڵەکان.؟**

– ئەزانی نێوانی چاڵەکان و سەیارەکە زۆر کەم بوو، ئەوە نەبوو هەموومان دابگرنە خوارەوە و کۆمەڵمان بکەن و پاشان بخرێینە

چاڵەکانەوە، هەر ڕێك سەیارەکە لەبەردەمی چاڵەکەیا ڕاوەستا، کە لە دەرگاکە دایان دەگرتین سەربازەکان بەپاڵ خستمانیانە ناو چاڵەکەوە.

- **چاڵەکان چەنێ قوڵ بوون.؟**

– هەر مەترێك شتێك زیاتردەبوو.

- **پانی و درێژی هەر چاڵێک چەنێک بوو.؟**

– من ئەوکاتە بە تەمەنم شۆفلم نەبینی بوو چاڵ بکات، بۆیە ئەوکاتە وامدەزانی چاڵەکان بەقەدەر دەمی شۆفڵەکەیە، بەڵام کە بیر دەکەمەوە ئەو هەموو خەڵکە لەیەك چاڵێکدا جێگامان بووەوە ئێستا دەزانم گەورە بوو، ڕەنگە بەقەدەر ژوورێکی ئاوا پێنج بە شەش مەترێك بووبێت، دیاربوو هەر چاڵێك بۆ نەفەری ناو یەك سەیارە بوو. شتێکی سەیرم بینی کاتێ خستمانیانە ناو چاڵەکەوە پێش ئەوەی تەقە بکەن پوورم نازانم بورایەوە یان مرد، لە شوێنی خۆی کەوتە سەر زەوی و جوڵەی لێبڕا، بەخوا وا هەست دەکەم لە ترسا زراوی چووبێت یان دڵی ڕاوەستابێت، بە ڕاستی دەبوو هەموومان بەبێ ئەوەی تەقەمان لێبکەن دڵمان لەکار بکەوتایا ئەوەندە حەپەسابووین، چونکە بە هیچ جۆرێك نابوو ئێمە بەو جۆرە بکوژن، هیچ شتێکمان نەکردبوو تا ئاوا لەچاڵێکدا بێکەس کوژمان بکەن و

مەگەر تەنها خوا بزانێ ئێمە لە کوێین، نە کفن و نە قەبر و ئاخر ئێمە قەت نەمانبیستبوو لە یەك مردوو زیاتر بخرێتە گۆڕێکەوە چۆن دەبوو ئەو هەموو ژن و منالّە ئەو چالّە ببێتە قەبرمان. هەموومان تاسابووین و هەناسەمان تا دەهات کورتتر دەبوو، ورتەمان لەخۆمان بڕی بوو.

- **تۆ کەوتبوویتە کوێی چالّەکەوە.؟**

– تەنیشتی ئەو شوێنەی شۆفلّەکە بڕی بووی.

- **ئەی کەوتبوویتە تەنیشت کێوە.؟**

– من لە تەنیشتی دایکم و خوشکەکانمەوە بووم و لە ترسا چمکی کراسەکەی دایکمان توند توند گرتبوو، خۆمان بچووك دەکردەوە و دەلەرزین.

- **ئێستا کلت کەی بوو.؟**

– خۆر ئاوا بوو بوو، بەلاّم هێشتا ئاسمان رۆشن بوو دنیات دەبینی.

- **ئەو دوو منالّەی لەناو سەیارەکە لە تینوان و لەگەرما مردن، چیان لە تەرمەکانی ئەواتکرد.؟**

- ئا بیرم کەوتەوە باش بوو ئەو پرسیارەتکرد، ئەوکاتەی ئێمەیان خستە ناو چاڵەکەوە، یەکێ لە سەربازەکان لەناو سەیارەکە لاشەی دوو منداڵەکەشی هێناو هەڵدایەوە ناومانەوە.

- **هەردوو لاشەکەی پێکەوە هێنا.؟**

- نەخێر سەیارەکە نزیك بوو لە چاڵەکەوە هەرجارەی لاشەیەکیانی لە سەیارەکە دەرهێناو هەڵیدایە ناو چاڵەکەوە.

- **چەند سەرباز لە دیار چاڵەکان بوو.؟**

- لە نزیکی چاڵەکان و لای سەیارەکە هەبوون، بەڵام لە دیار چاڵەکان دوو سەربازی لێبوو.

- **جلەکانیان چۆن بوو.؟**

- سەوزی بەڵەك بەڵەك.

- **چەکەکە دەستیان چی بوو.؟**

- کلاشینکۆف.

- **چەکەکانیان چۆن گرتبووە دەستیانەوە.؟**

- به هەردوو دەستیان، دەستێکی لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکە و دەستەکەی تری پێشەوەی تفەنگەکەی گرتبوو، رووی چەکەکانیشیان کردبووە ئێمە.

- **پێشتر هیچ کات لە نزیکەوە گوێت لە دەنگی تەقەی کلاشینکۆف بوو بوو.؟**

- ئەی چۆن، چەندینجار باوکم نیشانی دەنایەوە و تفەنگەکەی دەدایە دەستی منەوە فێری دەکردم لە نیشان بدەم.

- **هیچ کات بینی بووت تەقە لە خەڵک بکرێت و بە بەرچاوتەوە فیشەکی بەرکەوێت.؟**

- نەخێر. تەنها ئەو جارەی تۆپبارانی کوڵەجۆ کرا تۆپێك دابووی لە ماڵی رۆستەمی حاجی حەمەجان ژنەکەی و دوو منداڵی کوشت و منداڵێکی تریانی بریندار کرد، ئیتر کەسم نەبینی بوو بە گوولە بمرێت.

- **ئەو دوو سەربازەی بەدیار چاڵەکانەوە راوەستابوون، دەموچاویان داپۆشرابوو.؟**

- نەخێر، تەنها بێری لەسەریان بوو.

- **رەنگی بێریەکانیان چۆن بوو.؟**

- سوور بوو.

- **ئەی پۆستاڵەکانیان.؟**

– رەش بوو.

- **پێش ئەوەی تەقەتان لێبکەن، تەماشای سەربازەکانت کرد.؟**

– بەڵێ.

- **چۆن دەهاتنە پێشچاوت.؟**

– وەڵا زۆر ترسناك بوون، تۆ بیهێنە پێشچاوی خۆت تۆ دانیشتبیت و کەسێك بە دار یان بە بەردێکەوە بەدیارتەوە وەستابێت و بزانی لێت دەدات دەترسیت، ئەمان تفەنگەکانیان روو کردبوو لە ئێمە و ئێمەش لەناو چاڵەکەیا بووین ئەوانیش لە دەرەوە و لەسەر ئەو خۆڵەبوون کە شۆفلەکە لە چاڵەکە دەری هێنابوو ئەوەنەی تر بەرز بووبوونەوە بەسەرمانەوە، زۆر ترسناك بوون.

- **لەو کاتەیا هیچ ئومێدێکت هەبوو رزگارتان بێت.؟**

– وەڵایی نازانم بڵێم چی، لەبەر ئەوەی هیچ شتێکمان نەکردبوو بەلامەوە سەیر بوو کە دەیانەوێ بمانکوژن، بۆیە وا هەستم ئەکرد خوا نایەڵێت ئەو غەدرەمان لێبکەن. باوەڕم وابوو کەسێك دێت رزگارمان دەکات.

- **لە خەیاڵی خۆتدا ئەو کەسە کێ بوو.؟**

- نازانم بیرکردنەوەکەم بە دەست خۆم نەبوو، بەڵام ئەمووت رەنگە باوکم بێت.

- **ئەو ماوەیە زۆری خایاند کە ئێوە لەناو چاڵەکان ئامادە کراون بۆ گوولەباران کردن و سەربازەکانیش تفەنگەکانیان بە دەستیانەوەیە و ئامادەن بۆ تەقەکردن، تا ئەوکاتەی تەقەیانکرد.؟**

- که له سەیارەکان دایانگرتین تا خستمانیانە ناو چاڵەکان و دانیشتین و تا ئەو کاتەی تەقەیان کرد، هەمووی رەنگە دە دەقە بۆ چارەکێکی خایاندبێت.

- **یەکەمجار تەقە لە ئێوە کرا یان لە چاڵەکانی تر.؟**

- وا هەست دەکەم کە لەیەك کاتدا تەقە لە هەموو چاڵەکان پێکەوە کرابێت، چونکە پێش ئەوەی تەقە لە ئێمە بکەن، گوێم لە تەقەی تر نەبوو، یەکەم دەسترێژ کە لە ئێمە کرا لەوانەیە هەر ئەوکاتە لە چاڵەکانی تریش دەستی پێکردبێت.

- **پێت وانیە رەنگە ئێوە یەکەم وەجبە بووبن کە دراونەتەبەر دەسترێژی گوللە، بۆیە گوێتان لە تەقەی تر نەبووە.؟**

- نا وانەبوو، چونکە ئەگەر وابوایا دەبوو دوای ئەوەی تەقەیان لە ئێمە کردو ئەو هەموو ژن و منداڵەیان کوشت، دەبوو لە چاڵەکانی تەنیشتمەوە دەنگی تەقەی تر بهاتایا. من تا ماوەیەك دواتریش

هۆشم بەخۆم بوو گوێم لە هیچ تەقەیەکی تر نەبوو، تەنها ئەو هاڕە هاڕەی یەکەمجار بوو کە لە هەموو شوێنێکەوە پێکەوە دەستی پێکرد.

- **پێش ئەوەی تەقەکان دەست پێبکات، گوێت لە هیچ دەنگێک بوو کە هەست بکەیت فەرمانی پێکردن تەقە بکەن، یان هەر لەناکاو گوێت لە دەنگی تەقەکان بوو.؟**

– دیار بوو کەسێك فەرمانی پێکردن، بەڵام من عەرەبیم نەدەزانی نازانم چی پێیان ووت.

- **ئەو وشەیەت بیر نیە کە گوێت لێی بوو.؟**

– نەخێر، تەنها گوێم لە دەنگێك بوو لە دوورەوە وەك بڵێی هاواری لێیان کرد و ئیتر ئەوانیش دەستیان بە تەقەکردن کرد.

- **تەقە کردنەکان ماوەی چەنێکی خایاند.؟**

– نازانم، بەڵام دەزانم کە فیشەکیان تەواو بوو مەغزەنیان گۆڕی، دووجار مەغزەنی تریان خستەسەر و هەموویان پێوەنایین.

- **لەکاتی تەقەکاندا چیتکرد، لە ترسا چاوت نوقاندبوو، سەرت داخست، دەتوانی وێنەی ئەو ساتەی خۆت بێنیتەوە پێشچاو.؟**

- بەڵێ هەروا دەزانم ئەم دەقەیەیەو بەردەوام لە پێشچاوەمە و تا دەمرم لەپێشچاوم لاناچێت، من ناڵێم ناترسام، زۆریش دەترسام بەڵام وەك بڵێی حەپەسابووم یان خوا خۆی ویستبووی من شتەکان ببینم چاوم ئەوەندەی تر کرابووەوەو زەق زەق تەماشام دەکرد کە چۆن بەدەم تەقەکردنەوە سەربازەکان دەستیان بەناو خەڵکەکەدا دەسوڕاند وەك ئەوەی ئاوەڕشێن بکەن.

- **کەواتا چاوت لێبوو کە فیشەك بەر خەڵکەکە دەکەوت.؟**

- بەڵێ چاوم لێبوو، بەڵام ئەوە نەبوو کوشتنەکان لەسەر خۆبێت و هەرجاری فیشەك لە یەکێ بدات، ئەوان وەك ئاوەڕشێن دەستڕێژیان بەناوماندا کرد و لە چەند ساتێکی کەمدا هەمووی فیشەکی بەرکەوت و کەوتن بەسەر یەکتریدا.

- **لەو کاتەیا تەماشای دایك و خوشکەکانت نەکرد، ئەوان وێنەیان چۆن دەهاتە پێشچاوت.؟**

- با، ئاگام لێی بوو چۆن فیشەك بەریان کەوت و چۆن شەهید بوون.

- **بەبوورە دەزانم بەم گێڕانەوانە لە ناخەوە ئازارت دەدەم، بەڵام تۆمارکردنیان بۆ مێژووی میللەتەکەمان و بۆ تۆماری رووداوەکە گرنگە، بۆیە ئەگەر دەتوانی زیاتر ئەو وێنانەم بۆ باس بکە کە بە چاوی خۆت بینیتن.؟**

- یەکەمجار فیشەکێ دای لە سەری دایکم، سەرپۆشێکی سپی لەسەر بوو، سەرپۆشەکەی سەری پەڕی و دایکم کەوت، بینیم خوێن بە لارومەتیدا بە فیشقە هاتە دەرەوە. گوللەکان زۆر بەخێرایی بەدوای یەکەوە بوون فیشەکێك دای لە لارومەتی لاولاوی خوشکم ئەویشم بینی کەوت، سنوری خوشکم لە ترسا ئاوا لەپی دەستی راستی کردبۆوە و وەك ئەوەی بیەوێ بە دەستی نەهێڵێت گوللەکە بەری کەوێت فیشەکێك دای لە دەستی و فیشقەی خوێنم بینی لە دەستییەوە دەرچوو کەوتە سەر لاشەکەی دایکمدا، ئەوەی گێلاسم لەبەرچاو نیە واهەست دەکەم کەوتبووە ئەو دیووی دایکمەوە لێمەوە دیار نەبوو. فیشەکێ بەر گۆشتەکەی شانی خۆشم کەوت و گرمۆڵە بووم، ئیتر هەمووی لە چاوتروکانێکدا بەسەر یەکدا کەوتن. ئەو ژنەی دایکم دەیناسی بەجۆرێك کەوتبوو وەك چۆن نوێژ دەکەیت سەرت لە زەویە و سمتی بەرزەوە بوو بوو، فیشەك لە سمتی دەداو لەوودیووەوە دەردەچوو خوێن و گۆشتی فڕێ دەدا. گوێم لە دەنگی خالۆژنم بوو ئامینە عەلی عەزیز یەك دووجار لەسەریەك بانگی دایکمی کرد و مرد. پێشتر هەموو خەڵکەکە خڕیووبوونە یەکتردا بەلام لەگەڵ تەقەکاندا بەسەریەکدا کەوتن و رەنگە منالّ هەبوووبێت فیشەکی بەرنەکەوتبێت و کەوتبێتە ژێر لاشەکانەوە و بەو جۆرە مردبێت. ئیتر دەنگی تەقە نەما تەنها گوێم لە دەنگی خوێن بوو. ئێستا نازانم چی وایلێکردم گوێ نەدەمە هیچ و هەستامە سەرپێ بەرەو ئەو جوندیە

رۆیشتم که لەو لایەی چاڵەکەوەبوو کە تەقەکانی لە ئێمە دەکرد و دایکم و خوشکەکانمی کوشت. پەلاماری عەسکەرەکەمدا نازانم ئەمویست چی بکەم ئایا رق بوو یان دەمویست لێی بپاڕێمەوە، حەپەسابووم سەرم لێشێوابوو یان خوا نابووی لە دڵم وابکەم، بە هەردوو دەستم توند توند کەمەری عەسکەرەکەم گوشی، سەرم بەرز کردەوە تەماشام کرد سەربازەکە هەردوو چاوی پڕ بووبوون لە فرمێسك، لەوێ ئەو ساتەم هاتەوە بەرچاو کە لە تۆپزاوا لەو کاتەی باوکم و زەلامەکانیان جیاکردەوە توند دەستی باوکم گرتبوو کە تەماشایی باوکمم کرد هەردوو چاوی پڕبوون لە فرمێسك، ئەم سەبازەش ئاوا هاتەبەرچاوم، ئیتر سەری تفەنگەکەی شۆڕکردەوە بۆ زەوی، بینیم (کلاشینکۆفێکی مزەلی بوو) دوو مەغزەنی بە تێپێکی رەش دابوو لە یەکتری. بەڵام یەکێك لەولاوە بە عەرەبی قسەی کرد، نازانم چی پێ ووت دیاربوو تێی خوڕی و ئەویش یەکسەر دوای قسەی عەسکەرەکەی تر کردیە قۆڵمداو فرێمی دایەوە ناو چاڵەکە. زۆر سەیربوو ئەو ئێستا خەریك بوو دەستبکات بەگریان کە بەو جۆرە من باوەشم پێداکردبوو، کەچی ئێستا فرێمی دایە ناو چاڵەکەوە، جارێکیتریش گوێم لە ئەو دەنگە بووەوە کە بە عەرەبی قسەی کرد، عەسکەرەکە رووی تفەنگەکەی تێمکرد و ریزێ فیشەکی تری تەقاند، ئەمجارە فیشەکێك دای لە پشتم و کەوتم. ئیتر وەك بڵێی بورامەوە یان بۆ ماوەیەك مردم ئاگام لە خۆم نەما. بەهۆش

خۆم هاتمەوە هەستم کرد دەتوانم بجولێم و ببینم، کەمێك لە چاڵەکەوە سەرم بەرزکردەوە سەرەتا کەس دیار نەبوو، زیاتر خۆم بەرز کردەوە بینیم وا سەربازەکان لە دوورەوە لەبەر لایتی سەیارەکان کۆمەڵ بوون و وەك ئەوەی دەیانەوێ بڕۆن. ئیتر نازانم لە ترسا بوو یان هی خوێن لێڕۆیشتن و برینەکانم بوو جارێکی تر کەوتم و ئاگام لەخۆم نەما. نازانم ئەمجارە ماوەی چەنی پێچوو کە هاتمەوە هۆش خۆم دەنگی گورەگوڕی شۆفڵ دەهات، هەستامە سەرپێ لە چاڵەکانی ئەو سەرەوە بینیم وا خۆڵ دەکات بەسەر چاڵەکاندا و پڕیانی دەکردەوە. هۆشم بەخۆم بوو کە ئەگەر لێرە بمێنمەوە خۆڵ بکەنە سەرماندا دەمرم، ویستم بڕۆمە دەرەوە دەنگی کچێك هات ووتی بۆ کوێ دەچیت، تاریك بوو بەهێواشی قسەم کرد ووتم ئایا تۆ ساغی یان برینداریت، کچەکە ووتی من زیندووم بەڵام قاچم لەژێر جەنازەکاندایە، پێم ووت هەستە با بڕۆین راکەین خۆمان بشارینەوە. بەهێواشی ووتی من نامەوێ دایکم بەتەنیا جێبێڵم و لە عەسکەر ئەترسم نایەم. کچێکی هەشت بۆ نۆ ساڵان دەبوو. هیچ هەستێکی ترم نەبوو چی پێ بڵێم یان هەوڵی لەگەڵ بدەم بێتە دەرەوە، ئێستا لۆمەی خۆم دەکەم بۆچی ئەو کچەم دەرنەکرد، نازانم ئەوکاتە تەنها ئەوەندە هۆش و بیرم هەبوو.

کە دەمویست لە چاڵەکە دەرچم یەك دووجار لەبەر خوێن پێم دەخلیسکا لەسەر خۆڵەکە چونکە وەك قوڕاوی لێهاتبوو، بەڵام

دەرچووم لە دوورەوە لاندکرۆزەرێکم بینی لەبەردەمی لایتی شۆفلەکەوە دیاربوو بە دەوری چاڵەکاندا دەسورێتەوە بۆ ئەوەی دڵنیابن کەس راینەکردووە. لەبەر لایتی شۆفلەکە ناوەوەی لاندکرۆزەرەکەم بینی یەك شۆفێرێکی تیابوو جلەکەی مغاویری بوو بێریەکەی سەری سور بوو. تازە لە چاڵەکە دەرچوو بووم و نەمدەتوانی بگەڕێمەوە، لە پەنای ئەو خۆڵەی شۆفلەکە دەریهێنابوو خۆم دا بەزەویدا و خۆڵی زەویەکەش هەمووی لم بوو کەمێك چاڵم کرد و تیایا راکشام، زەویەکە گەرم بوو وەك ئەوەی لەناو جێگەیەکدابم ئیتر لە ئیرادەی خواوە نازانم دەبورامەوە یان دەمردم و زیندوو دەبوومەوە یان خەوم لێدەکەوت هیچ ئاگام لە خۆم نەما. نازانم ماوەی چەنێکی پێچوو دەنگێك لەناو گوێما دەهات هەستم کرد دەنگەکە دەنگی باوکمە، خوایە ئەمە راستیە یان خەون دەبینم، بانگی دەکردم تەیمور هەستە تەیمور هەستە، نە جارێك و نە دوان چەند جارێك ئەم دەنگە لەناو مێشکمدا دەنگی دەدایەوە، شتێك هاتە بەرچاوم وەك تامۆرایی پیاوێك جلێکی سپی لەبەری بوو بە دیار سەرمەوە راوەستابوو ئەمجارەش پێمی ووت تەیمور هەستە دوام کەوە. خوا ئاگادارە لەپێش چاوم کە رۆیشت هەندێك خۆڵ لەژێر پێی دەرپەڕی و دایە سەروچاوی مندا، لە دەنگەکە هاتمەوە هۆش خۆم ئیتر تەواو بە ئاگا هاتمەوە و هەستام دوای پیاوەکە بکەوم سەرم بەرزکردەوە تەماشام کرد هیچ کەسێکم نەبینی، دەڵێم رەنگە خوا

فریشتەی بۆ ناردبم تا هەستم و لەو شوێنە دورکەومەوە چونکە ئەوکاتەی کە من هەستام و کەوتمەڕێ شۆفڵەکە خەریك بوو نزیك دەبۆوە لەو چاڵەی من لێی هاتبوومە دەرەوە.

- **وەك هەستت پێکردبێت چەند شۆفڵ لەو ناوە بوو.؟**

- تەنها یەك شۆفڵ دیاربوو.

- **تەنها هەوڵتدا لە شوێنی گوللەبارانکردنەکە دووركەویتەوە.؟**

- کەوتمەڕێ، سەرەتا دەمویست ئەوەنە دوور بکەومەوە کە مەترسی ئەوەم نەمێنێ ئەگەر لایتی سەیارەیەك هات، یان بەهۆی لایتی شۆفڵەکەوە بمبینن. لە خۆمەوە کەوتمەڕێ و بێ ئەوەی خۆشم بزانم بەچی ئاراستەیەکدا دەڕۆم، خوێنم لە بەر دەڕۆیی و دەکەوتم و هەڵدەسامەوە. دونیا تاریك بوو بوو، بەڵام ئاسمان روون بوو. خاکەکەی ئەوان وەك کوردستان نەبوو هەمووی دەشتایی و تەنها رۆکێکی دڕکاوی لێی روابوو دواتر زانیم پێی دەڵێن (عەگول)، لەبەر ئەوەی تاریك بوو ئەو هەموو دڕکەم لادەبوو بە جوندی. لە ترسا ئاراستەکەم بە لایەکی تردا دەگۆڕی هەندێك رێگەم دەکرد و کۆمەڵە دڕکێکی ترم دەبینی و بەلایەکی تردا رام دەکرد. لە دوورەوە ئاگرێك دیاربوو نازانم ئاگری چی بوو دەچووە ئاسماندا سەرەتا بەرەو لای ئەو ئاگرە کەوتمەڕێ، بەڵام بیرم کردەوە کێ دەڵێت مەعەسکەر نیە،

له خۆمەوە بەلایەکی تردا ئاراستەکەم گۆڕی، کەمێك ڕۆیشتم و تەماشام کرد لە دوورەوە لایتی سەیارەیەك دیاربوو، چونکە زەویەکە هەمووی تەختایی بوو واهەستم دەکرد زۆر نزیکی منە و ئێستا دەگاتە سەرم، بۆیە ئەو جارەش لەترسا بە لایەکی تردا ڕۆیشتم، لە ڕاستیا من لە هەموو شتێك دەترسام و چەند جارێك ئاراستەی ڕۆیشتنەکەم دەگۆڕی، جارێ بەلای چەپ و جارێ بەلای ڕاست و دەگەڕامەوە سەر هەمان ئاراستەی پێشووم. دەترسام دەمووت ڕەنگە زانیبێتیان من بە زیندوێتی لە ناو چاڵەکە دەرچووم و ئەوە بەشوێن مندا دەگەڕێن، هەزار دالْغەی خراپم بۆخۆم دروست دەکرد، دەمووت کێ دەڵێت ئێستا کچەکەیان بە زیندوێتی نەبینیووە و ئەویش لەترسا وتبێتی کوڕێك ئێستا زیندوو بوو دەرچوو. سەرم لێشێوابوو تۆ وەرە بیهێننە پێشچاوی خۆتان منالێکی دە دوانزە ساڵان توشی ئەو هەموو چەرمەسەریە بێت و بە بەرچاوتەوە هەموو کەسوکارت بکوژرێت و خۆشت بە برینداری دەرچیت بەئازارێکی زۆر و ترسێکی زۆرەوە بە شەوێکی تاریك و لە دەشتێکی چۆڵدا دەبێت چۆن بێت، خۆشم نازانم چۆن ئەوەنە وورە و توانام هەبوو بەرگەی ئەو هەموو مەینەتیە بگرم، ئەو کچەی بە زیندوێتی کە لەناو گۆڕەبەکۆمەڵەکە بەجێمهێلا، دەهێنمەوە بەرچاوی خۆم و دەڵێم بەس نەبێت منیش وەك ئەو نەترسام و ئەگەر منیش نەموێرایا دەرچم و بەناو تاریکیدا بکەومەڕێ، ئەوە ئێستا کێ دەیزانی ژن و

منالّەکانی ئەنفال چیان بەسەرهاتووە، دەبوو تا هەتایە کورد بەدوای چارەنوسیاندا بگەڕایا، بەڵام دەڵێم خوا منی بۆ ئەوە رزگارکرد بۆ ئەوەی ئەو تاوانە بە شاراوەیی نەمێنێتەوە.

- **شوێنێک هەبوو دابێتەپێشچاو، یان بەهۆکارێکەوە ئەو ئاراستەیەت گرتبێت کە بۆی دەچووی.؟**

– ناوەڵا لەو چۆڵەوانیە ئەوەی بەو شەوە دەرکەوتایا رووناکی بوو، ئاگرێك یان لایتی سەیارەیەك، بەڵام من لەوە دەترسام کە بەرەو هەر روناکیەك بچم، چونکە لە شوێنێکی وادا هەر روناکیەك نیشانەی سەربازگەو سەیارەی سەربازی بوو نەك ئاوەدانی، بۆیە هەر لەخۆمەوە رێگەم دەکرد. بەدەم رێکردنەوە بووم چونکە زەویەکە تاریك بوو پێم لە چاڵێك هەڵکەوت و خەریك بوو بەدەما بکەوم، هەڵوەستەیەکم کرد بزانم ئەم چاڵە چی بوو ترسام جارێکیتر کەوتبێتمە ناو چاڵێکەوە پڕبێت لە تەرمی خەڵك. بینیم شوێنی تایەی سەیارەیە، چونکە زەویەکە لم بوو زۆر دابەزی بووە خوارەوە. دانیشتم لە دیار ئەو چاڵە و ئەقڵم بەوەیا دەشکا بزانم شوێنی تایەی تازەیە یان کۆن، ووتم ئەگەر تازە بێت ئەوە بە شوێنی تایەی سەیارەکەدا دەڕۆم تا دەگەمە ئاوەدانی. هەر بە دەست لێدان لە شوێنی تایەی سەیارەکە زانیم تازەیە و ئەو ئاراستەیەم گرتەبەر. لەو پانزە دینارەی باوکم لە تۆپزاوا دایپێم و ووتی بۆ مەسرەفتان ئەگەر

چوونە ناو شارەوە، داوام لە خواکرد پێنج دیناری دەکەمە رای خواو مەولودی پێغەمبەر رزگارم بێت. ماوەیەکی زۆر بە شوێن تایەی سەیارەکەیا رۆیشتم، بەلام لە هەندێ شوێن جێگای تایەی سەیارەکە نەدەما، نازانم من ونم دەکرد یان بەهۆی لمەکەوە خۆی دەرنەچووبوو. یەك دوو جار ونم دەکرد و جاری وابوو دەمدۆزییەوە، چەند جارێك توشی ئەو حاڵەتە بووم و ئیتر ئەو رێگەیەم لێتێکچوو. بەلام خۆ تازە چی بکەم ناچار بووم هەر برۆم و بێئەوەی خۆشم بزانم چارەنوسم چی دەبێت. بیری دایکم و خوشکەکانم دەکرد، بیری باوکمم دەکرد، دەمووت دەبێت باوکم ئێستا لەکوێ بێت، ئەگەر من رزگارم بوو گەیشتمەوە باوکم چۆن بۆی بگێرمەوە دایکم و گێلاس و سنور و لاولاو بەو جۆرە کوژراون، دەبێت باوکم باوەڕ بەوە بکات من هیچ کەمتەرخەم نەبووم و خەتای منی تیا نەبووە. ئەبێ گللەیی ئەوە نەکات بلێت بۆ جێت هێشتن. بەوە دڵی خۆمم ئەدایەوە ئەمووت ئەو خۆی لە تۆپزاوا ئاگای لێبوو کە هیچ کەس دەسەلاتی نیە و ئەگەر کەس دەسەلاتی هەبوایا ئەوە باوکم رازی نابوو لە ئێمە جیای بکەنەوە. خەیاڵی ئەوەم دەکرد ئەی کێ دەڵێت باوکم و ئەوانیشیان نەهێناوە بۆ ئێرە و وەك ئێمە ئەوانیشیان نەخستۆتە ناو چاڵەوە و تەقەیان لێیان کردبێت، ئەمووت بەڵکوو باوکیشم بە زیندوویی دەرچووبێت و ئێستا لەم چۆڵەوانیە بگات پێم. ئەوە دەنگی باوکم بوو لە تەنیشت چاڵەکان لەناو گوێما

دەنگی ئەدایەوە بەخوا دیارە ئەویش لەم ناوەیە و ئاگای لێمان بووە چیمان بەسەرهات. بەو هیوایەوە رادەوەستام و تەماشای ئەملاو ئەولای خۆم دەکرد بەڵکوو دەرکەوێت. تەماشام کرد لە دوورەوە تارمایەك دەبینم جیاواز بوو لە رەنگی ئاسمان و ئەم رەشی دەکردەوە، دەمزانی ئەمە ئاسمان نیە و زەویش نیە چونکە لە زەویەکە بەرزتر بوو. بەرەو ئاراستەی ئەو تاریکیە چووم نزیك بوومەوە دەنگی سەگ پەیا بوو، لەبەر ئەوەی من منالّی لادێ بووم دەمزانی سەگ لە لادێ هەیە، زۆر دڵم بە سەگەکان خۆش بوو ووتم ئیشەڵا خوا فریام کەوتووە و ئەمە لادێ یە، زانیم ئێرە ئاوەدانی لێیە بەڵام دەشترسام لەوەی سەربازگە بێت. ئیتر زیاتر کەوتمە خۆم و بەرەو لای دەنگی سەگەکان چووم. سەگەکانیش بەرەو لای من هاتن، ترسی ئەوەم لێنیشت بەهۆی برینەکانی لەشم و خوێنەکەی گیانمەوە ئێستا دەمخۆن، لە ترسا لە شوێنی خۆم دانیشتم و دەستم بەناو لمەکەدا گێڕدا بەردێکم هەڵگرت تا ئەگەر زۆر لێم بێنە پێشەوە تێیان بگرم. سەگەکان بە وەڕە وەڕ لێم نزیك بوونەوە نازانم سێ بوو یان چوار سەگی زۆر گەورە بوون، منیش لە شوێنی خۆم چۆکم خستبووە سەر زەویەکە و نەمدەزانی چی بکەم باشە هاوار بکەم، بگریم، بەردەکەی دەستم تێبگرم، ئاوا بمێنمەوە، سەگەکانیش بە چواردەورما وەك ئەوەی بازنەیەك بە دەورمەوەبێت دەخولانەوە و دەوەڕین. دیاربوو بەلای سەگەکانیشەوە شتێکی سەیر بووە بەم

شەوە تاریك و ناوەختە و لەم چۆڵەوانیە ئەم شتە چیە لەوان پەیا بوو. سەگەکانیش لە دووری چەند مەترێکی کەمەوە بە دەورما دەسوڕانەوە و دەیان نەڕاند، ئەو بەردەی بە دەستمەوە بوو گرتمە سەگەکان وەك تاکە هۆکارێك کە بتوانم خۆمی پێ بپارێزم و نەیەنە پێشەوە لێم، خواوراسان دای لە یەکێ لە سەگەکان قوریسکانی، لای تارمایەکەوە کەسێك بە لایتێکەوە پەیابوو بە پیری دەنگی سەگەکانەوە هات و بینی وا من لە نێوان سەگەکانیاندا لەسەر چۆك دانیشتووم، کردیە هەرا سەگەکانی دوور خستەوە و هاتە لامەوە، لەلایەك زۆرم پێخۆش بوو ئەوە لەم چۆڵەوانیە خوا گەیشتە فریام و منی گەیاندە ئەم کابرایە، لەوەش ئەترسام ئەگەر پیاوێکی خراپ بێت ئەمداتە دەست حکومەتەوە و ئەمکوژن. زۆر زۆر ئەترسام من هیچ عەرەبیم نازانی و ئەویش عەرەب بوو چۆن تێی بگەیەنم من چی ئەکەم لێرە، بۆ بریندارم، چۆن گەیشتوومەتە ئەم بیابانە، دەبوو ئەم پیاوە چۆن لەمن بگات، ئایا بەزەیی پێما دێتەوە یان ئەویش عەرەبە و وەك عەسکەرەکانی تۆپزاوا رەحمی خوا لە دڵیا نیە و تەسلیمم دەکات یان دەمگرێتە خۆی. چاوەڕێی رەحمی خوا بووم شتێ بنێتە دڵی، هیچ نەبێت جارێ هەندێ خواردن و ئاووم بداتێ و کەمێك ماندوێتیم دەرچێت. بە عەرەبی هەندێ قسەی کرد نەمزانی دەڵێت چی و منیش لە خۆشی و لە ترسا وا شپرزە بووم خۆشم نەمدەزانی چی دەڵێم، زۆر دواتر بۆمیان دەگێڕایەوە کە داوام کردووە بمبات بۆ

(نەخۆشخانەکەی کەلار). لە ساڵی 2009 ئەو کابرایەم بینییەوە دەیووت ئەو دەشتە نەك ئاوەدانی و خەڵك تەنانەت گورگیشی لێنەبووە زۆرمان لاسەیر بووە بەو سەعات دوانزەی شەوە ئەم منالە کوردە بەگیان خوێناوییەوە چی دەکات لەم بیابانە. بۆچی داوادەکات بیگەیەنینە خەستەخانەی کەلار.

- **چۆن زانی بووی داواتکردووە کە بتبات بۆ نەخۆشخانەی کەلار.؟**

- وابزانم ئەم پیاوە کاتی خۆی ماوەیەك لە کوردستان لای موسڵ عەسکەر بووە بەو هۆیەوە کەمێك لە کوردی تێگەیشتووە. کابراکە باڵمی گرت هەستانمیە سەرپێ و چووین بەرەو تارمایەکە بینیم ئەمە رەشماڵە، بردمیە ژوورەوە پیرەژنێك و کچە عازەبێکی لێبوو، ئەوانیش خەبەریان بووەوە و زۆر سەرسام بوون منالێك بە شەرواڵ و کراسێکی کوردیەوە هەموو لەشی خوێنە و لەم چۆڵەوانیە چی گەیاندویەتیە ئەم رەشماڵەی ئەوان.! نان و دۆیان بۆ هێنام، خۆشم نازانم هۆی چی بوو داوای پیازم دەکرد، ئەوانیش لێم تێنەدەگەیشتن و پیازیان بۆ نەهێنام. هەرچەندە دواتر ئەوانەم زانی کە (ئەم کابرایە ناوی غانم بوو ماوەیەك لە موسڵ عەسکەر بووە کەمێك کوردی فێر بوو بوو)، جلەکانیان لەبەرم داکەند و سوتاندیان، بە پەڕۆ خوێنەکەی لەشمیان سڕی و دسداشەیەکیان هێنا کردیانە بەرم، سەیرم پێهات ئەوان پیاوێك و پیرەژنێك و کچێك بوون کەچی ئەو

دسداشەیەی کردیانە بەرم پڕ بەرم بوو. ئیتر خستمیانە سەر جێگەیەك، چونکە زۆر هیلاك و ماندوو بووم خەوم لێکەوت. بەیانی کاتێ لە خەو هەستام و ڕۆژ بووەوە بینیم ئەوان مەڕدارن و بۆ مەڕ لەوەڕاندن هاتوونەتە ئەم شوێنە، شەو تەنها ڕەشماڵەکەم بینی، بەیانی تەماشام کرد سەیارەیەکی وەك لۆری کەمێك بچوکتریشی لێبوو لەگەڵ کۆمەڵێك مەڕ و پیاوێکی تر و کوڕێکیش هەر لە تەمەنی خۆمدا دەبوو، زانیم دسداشەکە هی ئەو کوڕە بووە ناوی (خالید) بوو پیاوەکەی تریش باوکی بوو ناوی (عەبد) بوو. نەمزانی ئەوان شەو لەوێ بوون و من نەمبینی بوون یان بەیانی زوو هاتبوون.

هەر ئەو ڕۆژە بەو سەیارەیەی لێی بوو منیان گواستەوە، پیرەژنەکە و منداڵەکەش لە سەیارەکە سەرکەوتن، تا چاو بڕی دەکرد چۆڵەوانی بوو، ڕەنگە چەند سەعاتێك بەسەر خۆڵدا ڕۆیشتین ئیتر وورده وورده ئاوەدانیمان دەبینی، پێم سەیر بوو ئێوارە کە ئێمەیان هێنا بۆ ئەم بیابانە بەجادەی قیردا هێنامانیان و ماوەیەکی کەم بەسەر ڕێگەی خۆڵدا ڕۆیشت تا گەیاندمانیانە لای چاڵەکان، بەڵام ئێستا ڕێگە خۆڵەکە زۆر درێژ بوو نەدەبڕایەوە، لەبەر ئەوەی زمانم نەدەزانی نەمتوانی هیچ پرسیارێك لەوان بکەم بەڵام خۆم دەمووت ڕەنگە ئەمانیش لە حکومەت بترسن بۆیە بە جادەی قیردا ناڕۆن. دوای ماوەیەکی زۆر کە بەڕێگەوەبووین قافڵەو سەیارەی سەربازیمان توش بوو، زۆر ترسام وامدەزانی هەموو ئەو جەیشە بەدوای مندا دەگەڕێن،

هەستم بەوە دەکرد کە ئەوانیش لە عەسکەرەکان دەترسن چونکە ئەوکاتەی سەیارەی سەربازی دەرکەوتایا پیرێژنەکە عەباکەی ئەدا بەسەر مندا، بەوەیا ئەوەشم بۆ دەرکەوت ئەم ماڵە نیەتیان ئەوەیە بمبەن بۆ شوێنێك بمشارنەوە لە حکومەت. لە رێگە دووجاریش رایانگرتین نازانم سەیتەرە بوو یان وەك مەفرەزە دانرابوون. لەگەڵ سایەقەکە بە عەرەبی قسەیان دەکرد و جارێکیش ئاگام لێ بوو دەرگای دوواوەی سەیارەکەیان کردەوە تا بزانن ناو سەیارەکە چی تیایە.

- **کەوانەی رایانگرتن، سەربازبوون.؟**

– بەڵێ جلی عەسکەری لەبەریان بوو.

- **ترسی ئەوەت نەبوو دەستگیرت بکەن.؟**

– چۆن ناترسام، من وام دەزانی ئەو هەموو قافڵە سەربازییەی لە رێگە توشمان دەبوون بۆ گیان من هاتوون و کە رایانگرتین واهەستم دەکرد زانیویانە لەناو ئەم سەیارەیەم، نەك هەر من دەمزانی سایەقەکە و پیرەژن و مناڵەکەش لەمن زیاتر دەترسان. چونکە ئەوکاتانەی دەگەیشتینە عەسکەرەکان پیرێژنەکە منی دەخستە ژێر عەباکەیەوە و دەیدا بەسەر من و لەشی خۆیدا تا سەربازەکان نەمبینن. ئەوجارەی کە لەگەڵ سایەقەکە قسەیانکرد لەبەر ئەوەی لۆریەکە بەرز بوو لەخوارەوە ناوەوەی دیار نەبوو ژنەکەیش منی

خستبووە ژێر عەباکەی و لە 2009 بۆمیان گێڕایەوە کە ئەوکاتە سەربازەکان ڕێیان لێگرتووین بە سایەقەکەیان ووتووە بۆچی واخێرا دەڕۆیت، ئەویش پێیانی ووتووە نەخۆشی خەتەرم پێیە.

- **مەبەستیان تۆبووە کە وتوویانە لەخۆشمان پێیە.؟**

– نا، ئەو پیرەژنەی عەباکەی ئەدا بەسەر من و خۆیدا، بەحساب ئەو نەخۆشەکەیە. رەنگە دوو بۆ سێ سەعات زیاتر بە رێگەوە بووین تا گەیشتینە ئاوەدانییەك شار بوو، دواتر پێمیان دەووت کە ئەو شارەم بینیووە کردوومەتە هەرا ئەوە کەلارە بمبەنەوە بۆ کەلار. بەتەنیشتی ئەو شارەدا تێپەڕین و ماوەیەکی تر رۆیشتین گەیشتینە (دێیەك) حەوت هەشت ماڵێك دەبوو، خەڵکی دێیەکەم بینی زۆر سەیر بوون لە بەرچاوم هەموویان جلەکانیان لە یەکتری دەچوو، پیاوەکان هەنێکیان جامانەی رەش و هەنێکیان جامانەی سوریان دابووە سەرخۆیانداو بە پەتێکی رەش بەستبوویان. ئەمووت ئای خوایە دەبێ من کەوتبێتمە کوێوە ئەمانە چین بۆچی جلەکانیان ئاوایە.؟ ئەی بۆچی ئەو عەرەبەی شەو و ئەم سایەقەش جامانەیان ئاڵاندبووە سەریانەوە و بۆچی ئەمان جلیان لەوان ناچێت. چووینە یەکێ لەو ماڵانە دیار بوو وەك بڵێی ماڵی خۆیان و کەسوکاریان بوو بەڵام خێزانی تریشی لێبوو، منیان خستە سەر قەرەوێڵەیەك و ئیتر مناڵەکانیان دەوریاندابووم و خێزانەکەیش بەیەکدا دەهاتن و

دەچوون و هەستم دەکرد شپرزە بوونە. دەترسام خوایە دەبێت چیم بەسەر بێت، پاش ماوەیەك کەوتنە تەداوی برینەکانم بە پەڕۆ دەیانسرپیەوە و ڕۆنیان لێی ئەدا، زۆر زۆر ئازارم هەبوو بەلآم بەوە دڵخۆش بووم دەمووت ئەگەر ماڵێکی باش نەبن تەداویم ناکەن و ئیشەلآ نامدەنە دەست حکومەتەوە.

- ئەتپرسی گوندەکە ناوی چی بوو.؟

— بەچی بپرسم، من زمانی ئەوانم نازانی. بەلآم دوای ئەوەی ماوەیەك بوو لەناویان مامەوە و فێری زمانەکەیان بووم، ئەوکات زانیم ناوی (ئالعێشم) بوو.

- ئەو پیاو و ژنەی لە ڕەشماڵەکەوە هێناتیان بۆ ئەم گوندە، خۆیان لەگەڵت مانەوە لەو ماڵە.؟

– تا دوای نیوەڕۆ مانەوە و دواتر ئەوان ڕۆیشتن و بە تەنها منیان لەم ماڵە بەجێ هێشت. وەك بڵێی ئیحساسێکم بۆیان هەبوو کە ئەوان یەکەم کەس بوون بینیانم و منیان گرتە خۆیان و لەو بیابانەوە هێنامیان بۆ ئەم گوندە، پێم ناخۆش بوو ڕۆیشتن و حەزم دەکرد ئەوانیش هەر لەگەڵم بوونایا. بەلآم ئەم ماڵەش زۆر بوون لەماڵەوە و منالی هاوتەمەنی منیان هەبوو، دەورم چۆڵ نەبوو. ماوەی دە ڕۆژێك لەو ماڵە بووم چەند ڕۆژی سەرەتا باری دەرونیم زۆر خراپ بوو، کە

ئەوانم دەبینی ژن و منداڵ و پیاو لەسەر سفرە دادەنیشتن بۆ نان خواردن، لە بەرچاوم دەبوونە ماڵی خۆمان باوکم و دایکم و خوشکەکانم دەهاتنە بەرچاوم، دەستم دەکرد بە گریان و نانم پێ ناخورا. ئەوان وایان دەزانی لە تاو ئازاری برینەکانمە کە دەگریم، پەڕۆیان گەرم دەکرد و دەیانخستە سەر برینەکەم. زۆر ئازارم ئەچەشت تا زیاتر تێکەڵ بەوان دەبووم دەگەڕامەوە بۆ ناو خێزانەکەی خۆمان و ماڵی خۆمان لە کوڵەجۆ، نازانم لەبەر ئەوەبوو ئەوانیش ماڵیان لە گوندبوو ژیانی لادێی خۆمانم بیر دەکەوتەوە یان بەهۆی ئەوە بوو تازە دایکم و خوشکەکانمم بەو جۆرە بینی مردبوون، بەردەوام لە خەم و ئازاردابووم. ماوەی ئەو دە رۆژە کەمێك لەگەڵ منداڵەکانیان هۆگری یەکتر بووین و بە ئیشارەت لەیەك تێ دەگەیشتین، ئێوارانێك خۆرئاوا بووبوو هەستم کرد نەك هەر ئەو ماڵەی منیان لێی دانابوو هەموو گوندەکە شپرزە بوون و وەك ئەوەی شتێك رووی دابێت یان بزانن شتێك دەبێت هەموویان کەوتبوونە هاتووچۆ و مقۆمقۆ و قسەیان دەکرد، من هیچ تێنەدەگەیشتم بەڵام ئەمزانی شتێکی خراپ رووی داوە. لە خەیاڵی خۆمەوە بیرم دەکردەوە بڵێت وەك گوندەکانی ئێمە حکومەت پەلاماری ئەوانیش بدات و لەوە بترسن جێش و جاش بێتە سەریان، بەڵام چونکە عەرەب بوون و حکومەتیش عەرەب بوو باوەڕم ناکرد حکومەت رقی لەمان بێت خۆ ئەمان کورد نەبوون. نەمزانی چیە و زۆریش ناخۆش

بوو ئەو هەستەم هەبوو کە ئەترسم بەهۆی منەوە توشی شتێکی خراپ هاتبێتن و حکومەت زانیبێتی من لەم گوندەم؛ بەڵام نەمئەتوانی ئەم هەستە دەربڕم، بۆیە وەك ئەوان پێمەوە دیار بوو کە مشکیلەیەك هەیە بەڵام نەمئەزانی چیە. دەمووت ئەگەر هەرچیەکی ناخۆشیش بێت ئێستا ئەوان ئەزانن، بەڵام بۆمن ناخۆشتر بوو چونکە دەمزانی شتێك هەیە و نەمدەزانی چیە.

منیان خستە ناو تەرەکتەرێکەوەو ڕۆیشتین گوندەکەمان بەجێهێشت تەنها من و عەرەبێك تەرەکتەرەکەی لێدەخوڕی. بردمیان بۆ گوندێکی تر لە ماڵێك دایاننام پیاوێکی بە تەمەنی لێبوو دیار بوو خزمی خۆیان بوو. ئەوانیش هەر خێزانێکی زۆر بوون و کۆمەڵێ ژن و منالّیان هەبوو، ئەویش هەر لادێ بوو بەڵام ئەمەیان خانووەکانیان قوڕ نەبوو وەك خانووی شار وابوو. زۆر خزمەتمیان دەکرد و بە دەورما دەهاتن، نازانم منیان وەك چی بەوان ناساندبوو ئایا ڕاستیەکەیان بۆ ئەوانیش گێڕابووەوە و بەزەییان پێما دەهات، بە هەر هۆیەکەوە بوو دەمزانی زۆر چاویان لێمە و وەك ئامانەتێك مامەڵەم لەگەڵ دەکەن.

من زۆر دواتر ئەوانەم بۆ ئاشکرا بوو کە ئەو گوندەی یەکەم هەموویان یەك خێزان بوون و ماڵی حەوت برا بوون پێکەوە. کاك غانم برایان بوو، یەکێ لەو ماڵانە ماڵی ئەو بوو، دوای ئەو دە

ڕۆژەیش بۆیە ئاوا بە پەلە شەو منیان بە تەرەکتەرێك گواستەوە، تومەس برایەکیان بە ڕووداوی سەیارە مردبوو لە ترسی ئەوەی نەوەك بەهۆی تەعزیێ و قەرەباڵغیەوە من ئاشکرابم بۆیە منیان ناردبووە گوندێکی نزیك لە خۆیان و هەر خزمی خۆشیان بوو، لەوێ بمێنمەوە تا چارەیەکم بۆ دەدۆزنەوە.

- **ئەی دواتر نەتزانی ئەم گوندەیان ناوی چی بوو.؟**

– وەڵایی لە ڕاستیا نازانم و نەشم پرسیوە، چونکە من تەنها ئەوجارە ڕۆیشتمە ئەو گوندە و ئیتر هیچ جارێك نەچوومەتەوە بۆ ئەوێ، بەڵام دەزانم هەر خزمی خۆیان بوو، وە لەبەر ئەوان ئەو ماوەیە منیان گرتە خۆیان، بەڵام وەڵا ئەویش هەقی بەسەرمەوە هەیە، ئەگەر جارێکیتر بچمەوە ئەو ناوچەیە پرسیاریان دەکەم و لە شوێنی خۆیان مابن دەچمەوە لای ئەوانیش.

- **تا کەی لەوێ مایتەوە، یان ڕاستتر بڵێم تا کەی هێڵاکیانەوە لەو ماڵە.؟**

– دوای دوو هەفتە دەبوو لەو ماڵە بووم، شەوێك سەیارەیەك هات قەمەرەیەکی خسوسی شین بوو، دوو پیاوی تیابوو و منیشیان سەرخست و ڕۆیشتین بۆ جێگەیەکی تر ئەمەیان شار بوو، بەڵام دیار بوو زۆر دوور نەبوو لەو گوندەوە چونکە زوو گەیشتین. لەناو بازاڕ

راوەستا سایەقەکە هەر تەماشامی دەکرد وەك بڵێی نازانم بەزەیی پێما دەهاتەوە یان دەیوست جلم بۆ بکات نازانم چی بوو، دابەزی چووە دوکانێکەوە هاتەوە سەعاتێکی بۆم کڕی بوو دای پێم، هەرچەندە خۆم پێشتر سەعاتێکم لە دەست بوو شوشەکەی شکابوو ئیشیشی ناکرد، دیاربوو ئەو بینی بووی لە دەستما کە شکاوەو کارناکات بۆیە سەعاتی بۆم کڕی، زۆرم پێخۆش بوو لەبەر سەعاتەکە و لەبەر ئەوەیش ئەمزانی بەزەییان پێما دێتەوە و خۆشمیان دەوێ، منیش لەناو سەیارەکە سەعاتە شکاوەکەم دانا و تازەکەم کردە دەستم.

- **نەتزانی شارەکە ناوی چی بوو، بۆ نمونە تابلۆیەك نوسراێنت یان شتێك بخوێنیتەوە ئامازە بێت بۆ ناوی شارەکە.؟**

- من ئەوکاتە خوێندەوارییەکەم بایی ئەوە نەبوو ئەو شتانەی پێبخوێنمەوە، زمانیشم نازانی هیچ پرسیارێك بکەم، ئەوانیش کەسیان کوردییان نازانی تا لەیەك تێبگەین، بۆیە دوای چەند مانگێك زانیم (سەماوە) بوو. هەندێ بەناو شارەکەیا ڕۆیشت لە بەردەم ماڵێك راوەستاو بە ئیشارەت پێمی ووت کە دابەزین، چووینە ژوورەوە ماڵێکی زۆر قەرەباڵەغ بوون منیان بردە ناو خێزانەکە و هەموویان هەر تەماشام دەکەن و قسەیان دەکرد و سەیری منیان دەکرد، وەك ئەوە وابوو من شتێکی سەیربم بەلای ئەوانەوە. نە

ئەوان لە من تێنەگەیشتن و نە منیش هیچ لەوان تێدەگەم، زۆر ناخۆش بوو، بەڵام ئەمزانی ماڵی چاکن و ترسی ئەوەم نەمابوو کە حکومەت بمگرێت. هەرچەندە کە گەیشتینە ناو شارەکە سەرەتا ترسام و وتم ئیتر ئێرە حکومەتی لێیە و دەمناسنەوە، لەوە ئەچوو سایەقەکەش هەستی بە ترسەکەی من کردبێت بۆیە دابەزی و سەعاتەکەی بۆم کڕی، بەڵام ئەو سەعاتە بووە هۆی ئەوەی ترسم بشکێت وەك ئاماژەی ئەوەی تۆمان خۆش ئەوێ. ماوەیەکی زۆر کەم بوو گەیشتبووین لە دەرگایان درا، کاتێ دەرگایان کردەوە عەسکەرێك هاتە ژوورەوە هەمان ئەو جلوبەرگانەی ئەو عەسکەرانی لەبەر بوو کە تەقەیان لێمانکرد، سەوزی بەڵەك بەڵەك. بێ ئەوەی بە دەستی خۆم بێت لە ترسا رامکردە ژێر مێزێکەوە لە ژوورەکەیا بوو. سەیرمکرد خێزانەکە زۆریان دەستیان کرد بە گریان دیاربوو لە مەترسیەکەی من تێگەیشتن و بەزەییان پێما دەهاتەوە. عەسکەرەکە خۆی گۆڕی ئەویش دسداشەی کردە بەری و هاتە تەنیشتمەوە لەوە ئەچوو بیەوێ ترسەکەم بشکێنێت و وەك بڵێی هەستی ئەکرد زۆر لێی ترسابووم شەربەت و کێکی بۆم هێناو دڵمی ئەدایەوە. دوای چەند مانگێك زانیم ناوی (جاهل کتێل عشێم)ە ئامۆزا و زاواشیان بوو.

ئەو شەوە یەکەم شەو بوو کە گەڕابوومەوە شوێنێك حکومەتی لێبێت و لە شار بژێم، بۆ خەوتن من و منالێکی ئەو ماڵە کە هاوتەمەنی خۆم

بوو لە ژوورێك خەواندمانیان، شەو درەنگ میزێکی زۆرم دەهات و نەمدەزانی چی بکەم، چۆن بچمە دەرەوە و بزانم سەرئاویان لەکوێیە. کورەکەم خەبەر کردبۆوە بەڵام نە ئەو ئەیزانی من چیم دەوێت و نە منیش دەمتوانی تێی بگەیەنم بۆچی خەبەرم کردۆتەوە، هەر ئیشارەتم بۆی دەکرد و تا دەهات زیاتر تەنگاو دەبووم، بەهەزار حاڵ تێ گەیشت سەرئاوم دەوێت.

تا ماوەیەکی زۆریش لەوێ بووم بەهۆی زمانەکەوە هەموو شتێك بۆ من قورس بوو، لە ژیان و مەینەتیەکی ناخۆشدابووم. بەهۆی برینداریەکەشمەوە ئازارێکی زۆرترم دەچەشت چونکە نەیان وێرابوو بمەبەنە نەخۆشخانە چارەسەرم بکەن و ماوەی زیاتر لە بیست رۆژیش دەبوو لەو دوو گوندە بووم، ئەوان هەر بە پەڕۆ برینەکەیان دەسڕیی و بە رۆن چەوریان دەکرد، دیاربوو وەك بڵێی چڵك و پیسی لە برینەکەمدا کۆ بووبۆوە و برینەکەمی خراپتر کردبوو، هەر ئەو شەوەی گەیشتین بۆ بەیانی کاتێ رۆژ بووەوە خێزانەکە هەمووی لە دەورم کۆبووبوونەوە پیاوێك هاتە ژوورەوە دەرزی و لەفاف و شتی تەداوی هێنابوو، هەر چاوم کەوت بە دەرزی لە ترسا کردم بە هاوار و گریان، چونکە ئێمە لەوەتەی هەبووین مەگەر لە حکومەت بە قەدەر دەرزی ترسابێتین، چاومان کردبۆوە بەوە دەمانیان ترساند دەتانبەین دەرزیتان لێدەدەین، ئەگەر لەماڵ شتێکمان بکردایا بە دڵی دایکم و باوکم نەبوایا هەڕەشەی ئەوەیان لێمان دەکرد دەبێت

دەرزیت لێبدەین، هەر ماڵ ئێمە وا نەبوون بەڵکوو منالّی لادێ هەمووی بەو جۆرە ترسێندرا بوو، تەنانەت لە قوتابخانەیش زۆرجار مامۆستا کە واجبی ئەدایە سەرماندا دەیووت ئەگەر نەخوێنن ئەوە دوای دکتۆرتان بۆ دێنم دەرزیتان لێبدات، بۆیە بەقەدەر ترسی هەموو دونیا لە دەرزی دەترساین، بڕوا بکە من ئەو هەموو مەینەتیەم بەسەر هاتبوو، بە بەرچاوەمەوە ئەو هەموو ژن و منالّەیان بەکۆمەڵ کوشت، هاوارێکم نەکرد کەچی کابرا بە دەرزی و دەواوە خۆی کردە ژوورەوە خەریك بوو زیڕە بکەم، من هەر دەگریام و ئەوانیش بۆ چارەسەرکردنم پێویست بوو دەرزی و دەوای خۆیان بەکار بێنن، دەرزیەکیان لێمدا خەریك بوو لە ترسا رۆحم دەرچێت هەرچی نان و چایەك ئەو بەیانیە خواردبووم هەموویم هەڵهێنایەوە، شتێکی سەیرم لێیان بینی یەکێ لە کچەکانیان رشانەوەکەی منی کردە ناو دەستی خۆیەوە و چووە حەوشەکەیان رووی کردە ئاسمان و هەندێ بە دەنگی بەرز قسەی کردوو رشانەوەکەی بۆ ئاسمان هەڵدا، ئەوەندە بە لامەوە سەیر بوو وەك مەراقی لێهاتبوو دەبێت ئەوە مانای چی بێت، دوای ئەوەی فێری عەرەبی بووم پرسیاری ئەوەم لێکردن کە بۆچی واتانکرد. پێمیان ووت ئەوە داوامان لە خوا کردووە ئەم نەهەقیەی بەرانبەر بە تۆ کراوە قبولّی نەکات.

کەوتنە تەداوی برینەکانم و دیار بوو بەهۆی ئەوەی خۆڵ چووبووە ناو برینەکانەوە و ئەو ماوەیە بەبێ چارەسەر خەریك بوو ووشك

دەبوو، برینەکە لە ناوەوە خراپ بوو بوو هەمووی هەڵدایەوە و چڵك و پیسیەکەی لێدەرکرد و دەرمانێکی وەك ئارد سپی و ووشك بو کردیە سەریدا و لەفافی لێدا، چەند رۆژێك هەر لەو ژووره دایاننام و بەردەوام ئەم کابرایە دەهاتەوە خەریکی برینەکانم بوو، هەر خزمی خۆیان بوو ناوی (مەنشد) بوو دەستگیرانی کچێکی ئەو ماڵە بوو ناوی "کەریمە" بوو، ئەو پیاوە لە ساڵی 1989 حکومەت ئیعدامی کرد وابزانم جەماعەتی حزبی دەعوە بوون. ئەیانوت لە بەغدا مستەشفایەکی عەسکەری تەقیووەتەوە کۆمەڵێك خەڵکیان گرتبوو یەکیان ئەو (مەنشد)ەبوو.

وەك کوڕی ماڵەکە خۆیان هەڵسوکەوتیان لەگەڵم دەکرد و مناڵەکانیان رۆژانە دەهاتنە دەورم. ئیتر هەستم دەکرد تێکەڵ ئەم ژیانە تازەیە دەبم و بە ئیشارەت لەیەك تێ دەگەیشتین. کەمێك برینەکانم بەرەو چاکبوونەوە دەڕۆیشت و ئازارم کەم بوو بووەوە ئیتر بردمیانە ژوورێکی تر و لەگەڵ خۆیان دایان نام. شەو تەلەفزیۆنیان کردەوە رەسمی جەیش و سەدامی نیشاندا وا هەستم دەکرد بەڕاستی جەیشەکە و سەدام ئاوا لێم نزیکن لە ترسا دەستم کردەوە بە گریان، دیار بوو ئەوان لەم هەڵسوکەوتەی من ئەوە حاڵی بوون کە جەیشی سەدام منی هێناوە بۆ ئەم ناوچەیە و برینداری کردووم، هەستم کرد ئێستا بە تەواوی دڵنیابوون بۆچی یەکەم شەویش لەو کابرایە ترسام کە بە جلی عەسکەرییەوە خۆی کردە

ژوورەکەیا. بینیم یەکێ لە ژنەکانیان چاوی دەسڕی و دەگریا، دیار بوو یان ئەویش وەك من بە بینینی ڕەسمی سەدام و جەیشەکەی شتی بیر کەوتبووەوە یان بەزەیی بەمندا دەهاتەوە. هەر ئەو شەوە بۆ بەیانی منداڵەکانیان نازانم لەوە تێنەگەیشتبوون کە من لە وێنەی سەدام ترسابووم کە شەو لە تەلەفزیۆن پیشانیدا، هەندێ کتێبی قوتابخانەیان بۆ هێنام لاپەڕەکەیت هەڵئەدایەوە ڕەسمی سەدامی تیابوو بە قەڵەم شوختم ئەخستە سەر دەموچاوی، ئیتر بەوەیا هەستیان کردبوو من ڕقم لە سەدامە، بەڵام هێشتا نەیان ئەزانی هۆکارەکەی چیە. ڕۆژێك کابرای خاوەن ماڵ لە بازاڕ شۆفڵێکی بچوکی بۆ هێنابووم تا یاری پێبکەم هەر ئەوەندە لەناو عەلاگەکەیا دەریهێناو درێژیکرد بیداتە دەستم خوا ئاگادارە هەموو دیمەنەکانی ناو گۆڕەبەکۆمەڵەکە هاتەوە بەرچاوم، ئەو شۆفڵە بچوکە بوو بووە هەمان ئەو شۆفڵەی خۆڵی دەکرد بەسەر لاشەکاندا، زمانم نەبوو تێیان بگەیەنم لەتاوا کردبوومە شۆفڵەکەداو دابوومە بەر قەپ و دەمویست هەلا هەلای بکەم. ئەوان نەیاندەزانی چی شتێك لەناخی مندایە و بۆچی ڕقم لە شۆفڵە، هەستم دەکرد وەك شێت لێم دەڕوانن و هەمویان حەپەسا بوون، هاوارم دەکرد شەقم لە شۆفڵەکە ئەداو ئەمدا بەسینگی خۆمدا دەستم دەبرد بۆ برینەکانم بۆ ئەوەی تێبگەن. شۆفڵەکەم شکاند و بردیان فڕێیاندا دیاربوو شتێ حاڵی بوون کە حاڵەتەکەی من پەیوەندی بە شۆفڵەوە هەیە بەڵام

نەیاندەزانی چیە. ئەو پیاوەی تەداوی دەکرد زاواکەیان ڕۆژێك کتێبێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو دای بە کچەکەی دەستگیرانی، من یەکەمجار نەمزانی چیە دواتر بۆم دەرکەوت کە ئەو کتێبە قاموسی کوردی و عەرەبی بوو کچەکە ڕۆژانە دەهاتە تەنیشتمەوە داوای لێم دەکرد قسە بکەم، هەر وشەیەکم دەووت بەناو کتێبەکەدا دەگەڕا و دەیوست بزانێ چی دەڵێم بەم جۆرە خەریك بوون لەگەڵم تا فێری عەرەبی بم. وورده وورده ئازاریشم کەم دەبووەوە، دوای چەند ڕۆژێك کابرایەکی دسداشە لەبەریان هێنا کورد بوو بە کوردی کەوتە قسەکردن پرسیاری لێم دەکرد چیت بەسەر هاتووە خەڵکی کوێیت کوێت ژان ئەکا، سەرەتا وەك ئەوەی فریشتەیەکی خوا ببینم ئاوا دڵم پێخۆش بوو دوای ئەو هەموو ڕوداوە کە وامدەزانی هەموو کوردیان کوشتووە ئەمە کوردێکی تریش ماوە و بە زمانی کوردی قسە دەکات، بەڵام هەرچی پرسیاری کرد و ویستی قسەم لەگەڵ بکات، یەك قسەم لەگەڵ نەکرد.

- **بۆ قسەت نەکرد، لەکاتێکدا دوور نەبوو بۆ تۆ بێتە ڕزگارکەرو بتوانێ بتهێنێتەوە بۆ ناو کەسوکارت.؟**

– خۆشم نازانم حەپەسا بووم نازانم لە ئیرادەی خواوە زمانم بەسترا، خۆم نەمویست قسە بکەم، نازانم کامیان بوو. ئیتر دیار بوو ئەو واتێگەیشت من کەڕو لاڵ بم بۆیە زۆر گوێی پێنەدا و ڕۆیی، ئەوان ئەم

کوردەیان بۆ ئەوە هێنا بوو تا لە من تێبگەن چیم و بۆ وام بەسەر هاتووە و چی منی گەیاندبووە ئەو بیابانە، بەڵام هیچ حاڵی نەبوون. دواتر بیرم دەکردەوە بۆچی قسەم نەکرد کێ ناڵێ ئەم پیاوە نەیدەبردمە ماڵی خۆیان و داڵدەی دەدام تا دەمیگەڕانەوە بۆ کەلار، بەڵام ئەمووت خوا گەورەیە رەنگە ئەگەر ئەو پیاوە و ئەم ماڵەش بەوەیان بزانیایا بەسەرمدا هاتووە رەنگە لە ترسا هەر دەریان بکردایام، دیارە خوا لە چارەنوسی نوسیبووم جارێ بەو جۆرە بمێنمەوە و ئەوان راستیەکان نەزانن، هەرچەندە دوای ئەوەی هەموو رووداوەکانیشم بۆیان گێڕایەوە و تەواو دڵنیابوون لەوەی من چی مەترسیەکم بۆ ئەوان و ئەگەر حکومەت بەوە بزانێ داڵدەی منیان داوە رەنگە هەموو خێزانەکەیان تیابچن، بەڵام لە منداڵەکانی خۆیان زیاتر رێزیان دەگرتم. خۆشم منداڵێکی پاك و تەمیزی پێست سپی موو رەشی چاوو برۆ قەوی بووم، ئەگەر زۆر جوانیش نەبووبم لە چاو منالّی عەرەبەوە کە هەموویان رەش بوون، من جوان دەردەکەوتم، ئەوەش هۆکارێك بوو کە هەموویان زۆرتر خۆشیان بوێم.

تاکە شتێك بەلامەوە سەیر بوو، بەهیچ شێوەیەك نەیاندەهێشت لە دەرگای حەوشەکەیان بچمە دەرەوە، سەرەتا واتێگەیشتم پەیوەندی بە برینەکەمەوەیە و رەنگە لەبەر ئەوەیان بێت نەك منالّ لە کۆڵان بیکولێنێتەوە، بەڵام دوای ئەوەی برینەکەشم وشك بوو ئازاریشم نەمابوو هەر نەیاندەهێشت و لەوە دەچوو تەمبێی منالّەکانیشیان

کردبێت کە چاودێریم بکەن نەچمە دەرەوە، بۆیە جیا لەوەی گەورەکانیان نەیاندەهێشت بچمە دەرەوە، ئەگەر کەسیان دیار نەبووایا لەگەڵ منداڵێکیاندا بمویستایا بچمە دەرەوە منداڵەکانیش بەپەلە دەرگای حەوشەکەیان لەسەرم دادەخست. تەنانەت ئەگەر منداڵی ماڵە هاوسێیەکیش بهاتایەتە حەوشەکەوە منیان دەبردە ژوورەوە تا نەمبینن، هەرکات میوانیان بهاتایا منیان دەبردە ژوورێکی تر.

بووبووە خولیام دەبێ دەرەوە چی لێبێت وا ناهێڵن من ببینم، دوای ئەوەی فێری زمانی عەرەبی بووم بۆمیان دەگێڕایەوە بۆیە بەو جۆرە رێگەی چوونە دەرەوەیان نەداووم چونکە دوو دراوسێیان "رەفیق حیزبی" بوون و لە ترسی ئەوەی نەوەك منداڵەکانیان هەست بکەن تۆ غەریبیت لە ماڵمان و بچن لە ماڵەوەیان باسی بکەن و ئاشکرا بیت، بۆیە لە ترسی خۆمان و بۆ سەلامەتی خۆت ئەوەمان کردووە. هەرچەندە دوای ئەوەی تەواو فێری عەرەبی بووم و ئیتر وەك کوڕی ماڵەکە دەچومە کۆڵان بەهۆی حسێن کوڕی ماڵەکەوە کە منی لێبووم، بوومە برادەری کوڕی یەکێك لە رەفیق حیزبیەکان کوڕەکە ناوی (یەعروب) بوو، وابزانم رەسمێکمان هەیە پێکەوە من و ئەو و حسێن و کوڕێکی ترین کە ئەویش ماڵیان لە کۆڵانەکە بوو.

نزیکەی سێ مانگ دەبوو لەو ماڵە بووم ئەوکات ڕێگەیاندا دەرەوە ببینم، ئەویش دوای ئەوەی هەندێ فێری عەرەبی بووبووم، سەرەتاش کە ڕێگەی چوونە دەرەوەیان پێدام پێمیان ووت هیچ قسە مەکە و وەلامی کەس مەدەرەوە خۆت بکە بە کەڕولاڵ، دیاربوو ئەوان بۆیە ئەمەیان بە من ووت چونکە هێشتا عەرەبیەکەم زۆر باش نەبوو تا کەس هەست نەکات کوڕی ئەو ماڵە نیم، لەلایەکی تریشەوە لەوە دەترسان ئەگەر لەگەڵ منالی گەڕەك قسە بکەم نەك شتێك بدرکێنم.

- **ئێستا کە ماوەیەکی زۆر بوو لەو ماڵە بوویت لە سەماوە، بێگومان دەبێ زانیبێتت ماڵی کێ بوو.؟**

– بەلێ ماڵی "فالح سەفاح" بوو، بە ڕەحمەت بێت ئێستا لە ژیاندا نەماوە. کوڕێکی لە شوێنی ئەو ئێستا سەرگەورەی ئەو خێزانەیە ناوی کاك "حسین"ە. بنەماڵەیەکی گەورەن لە سەماوە. خێزانەکەی ناوی (زعێنە)بوو، پێیان دەووت ئوم حسێن. ژنێکی زۆر میهرەبان بوو، زۆر منی خۆش دەویست و بە هەموو منالەکانی وتبوو کە ئەمەش براتانە، ئیتر وەکوو کوڕی ماڵەکە بووم و هەستم ناکرد کچەکانیان هیچ جیاوازیەك لەنێوان من و براکانی خۆیان بکەن، کوڕەکان بە هەمان شێوە و دایك و باوکەکەش وەك منالی خۆیان مامەڵەیان لەگەلم دەکرد. تەنانەت جەژنەکان ئوم حسێن دەهاتە لام

پێمی دەووت حەزت لە چی رەنگێکە تا دسداشەی لەو رەنگەت بۆ بکڕم، بەیانیان زۆرجار خۆی دەهات خەبەری دەکردمەوە ماچی دەکردم کە لەخەو هەڵدەسام. پارەی ئەداپێم. هەستم دەکرد دەیویست ئەوەندە نازم بداتێ هەست بەبێ نازی دایك و باوك نەکەم. منیش ئەوم زۆر خۆش دەویست و رێزی زۆرم دەگرت.

- **کەی توانیت خۆت ئاشکرا بکەیت و شتەکانیان بۆ بگێڕیتەوە.؟**

– نەمووت ئەوان رۆژانە هەوڵیان ئەدا لێم تێبگەن، ئەو کچەیان (کەریمە) کە بە قاموسەکەوە لەگەڵم خەریك بوو خۆی مامۆستا بوو زۆر یارمەتی دەدام فێری عەرەبی ببم، وشەکانی فێرم دەکرد وورده وورده فێری زمانەکەیان بووم و شتەکانم بۆیان دەگێڕایەوە، بەڵام ئەوە نەبوو یەك رۆژ دانیشم و ئەوەی بەسەرما هاتووە بۆیان باس بکەم. رۆژانە لەگەڵ فیربوونی زمانی عەرەبیا بۆم باس دەکردن، دەتوانم بڵێم لە ماوەی چەند مانگێکدا ئەوان هەموو شتێکیان دەربارەی من زانی. بەڵام لەبەر ئەوەی خۆیان لەماڵەوە پێشتر بە (عەلی) بانگیان دەکردم، داوایان لێمکرد کە ئیتر لای ئەوان هەر ناوم (عەلی) بێت و ئیتر من (تەیمور) نیم، بەڵکوو (عەلی) بم. هەرواشمکرد و ناومیاننا عەلی عەبد عێشم، بووم بە شیعە و ئیتر وەك ئەوان نوێژم دەکرد.

- **تۆ پێش ئەوەی دەستگیر بکرێن، لە گوندەکەی خۆتان نوێژت دەکرد.؟**

– نەخێر نوێژم ناکرد.

- **دایک و باوکت نوێژیان دەکرد.؟**

– بەڵێ زۆر بەدین بوون. بەخوا وابزانم ئەوکاتەی بەو دەردەش چووین، مانگی رەمەزان بوو تا ملەسورەش بەڕۆژوو بوون، زۆربەی خەڵکەکەیش هەروابوون.

- **دوای ئەوەی ئەو ماڵە بە سەرگوزشتەی تۆیان زانی، ئێستا مامەڵەیان چۆن بوو.؟**

– لە پێشتر باشتر بوون لەگەڵم، لەماڵەوە هەروەك جاران رێزیان دەگرتم و جاری وابوو لەگەڵ خۆیان دەمیانبرد بۆ بازاڕ، بەلام هێشتا لە کۆلان کە کەمجار دەیانهێشت بچم، دەبوو وەك کەڕولاڵ خۆم نیشان بدەم. تا وای لێهات ئیتر عەرەبیەکەم وەك ئەوانی لێهات و لەبەر ئەوەی کەس نەبوو بە کوردی قسەی لەگەڵ بکەم کوردیم بیر چووەوە، عەرەبی زانیەکەم گەیشتە ئاستێك لەگەڵ زمان و لەهجەی ئەوان هیچ جیاوازیەکی نەبوو، ئیتر کەس باوەڕناکات عەرەب نەبم و کوڕی ئەو ماڵە نەبم، خۆ ئەگەر بمویستایا بشلێم کوردم ئێستا من زمانی کوردیم بیر چووبووەوە و کەس باوەڕی پێم ناکرد. ماڵەکەش

ترسی ئەوەیان نەما کە ئاشکرابم و منالّی گەڕەك و مالّە هاوسێ هەست بەوە بکەن من منالّی ئەوان نیم، ڕێیان بۆ کێشام ئیتر لەگەلّ منالّ و میوانیش قسە بکە و ئەگەر یەکێك پرسیاری ئەوەی کرد پێشتر چۆن قسەی ناکرد و ئێستا چاك بووە، بلّێم لە بەغدا عەمەلیاتم کردووە و چاك بوومەتەوە. ئیتر بە تەواوی لەگەلّ خێزانەکانیان تێکەلّ بووم و وەکوو منالّی خۆیان سەردانی مالّە خزم و ناسیاومان دەکرد و چەندینجار دەچووینەوە بۆ لادێکە (ئالعێشم) و دەگەڕاینەوە بۆ سەماوە.

- **دەبوو پێشتر ئەو پرسیارەم بکردایا، 15 دینارەکەی باوکت پێیدایت و قەلّماسنگ و گوللە کەلا بەردەکە چیان بەسەرهات.؟**

– ئا، بەلّێ، ئەوکاتەی لە گۆڕەبەکۆمەلّەکە ڕزگارم بوو لە گیرفانم بوون، کاتێ گەیشتم بە ڕەشمالّی مالّە عەرەبەکە و ئەوان جلە کوردیەکەیان لە بەرم داکەند و سوتاندیان و دسداشەیان کردە بەرم، 15 دینارەکەیان خستەوە گیرفانم، بەلاّم نەمزانی چیان لەنینۆکبڕو گوولله کەلابەرد و قەلّماسنگەکە کرد. ڕەنگە هەر وایانزانی بێت پەڕۆو بەردی ئاساییبن بۆیە نەیانخستەوە گیرفانم، بە ڕاستی منیش بیرم نەمابوو، نازانم نینۆکبڕکەش چی لێهات.

- **ئەو 15 دینارەی باوکت ڕایسپاردی کە چوونە شارەوە بۆ مەسروفتان سەرفی بکەن، تاکەی لات مایەوە.؟**

- تا سەماوە پێم بوو.

- **لەوێ چیت لێکرد.؟**

- ماوەی چەند مانگێك دەبوو لەوێ بووم هەر لام مابوو، ئەو ماڵە خۆیان هەمو شتێکیان بۆم دەکڕی و نەیان دەهێشت ووردی بکەمەوە. تەنانەت بۆ پسکیت و شیرینی و ئەو شتانەش بەردەوام کە هەرکەسێکیان بچوایەتە بازار بۆی دەهێنام، بەڵام دوای ئەوەی خۆم ئیتر ئەچوومە دەرەوە و لەگەڵیان دەچوومە بازار، ڕۆژێك کە بەنیاز بووین بچین بۆ ئالعێشم بایی 5 دینار لوقم و پسکیت و گوڵەبەڕۆژەم پێکڕی بۆ مناڵەکانی ئەوان لە لادێکە، ووتم من ئەو کاتەی لە ناو چاڵەکە دەرچووم 5 دینارم کردە رای خواو مەولودی پێغەمبەر رزگارم بێت، ئیتر لەوێ ئەو شتانەم پێی کڕی لە جیاتی خێرەکە و بەسەر مناڵەکاندا دابەشم کرد، بەخوا لەو کاتەشەوە لە مەلایەکم نەپرسی بزانم خێرەکەم قبوڵ بووە یان نا. دە دینارەکەی تریش کە بۆ ئەو کاتە زۆر بوو لەو ماوەیەی لەوێ بووم لەگەڵ مناڵەکانی ئەوان خەرجم کرد.

- **هەست دەکەی لە دوای چەنێک کە لەوێ مابوویتەوە، ئیتر خولیای گەڕانەوەت بۆ کوردستان لا دروست بوو.؟**

- ئەوان هەمووشتێکیان دەکرد بۆ ئەوەی ئازارەکانی من کەم بکەنەوە و هەست بە هیچ غەریبیەك نەکەم، هەستم دەکرد ماڵی هەموو براکان بەیەك چاو سەیرم دەکەن و لە هەموو ماڵێکیاندا وەك کوڕەکانی خۆیان وابووم. بەڵام بەردەوام لە خەیاڵی ئەوەدابووم بتوانم بگەڕێمەوە بۆ کوردستان بۆ ناو کەسوکاری خۆم، بەتایبەتیش لە دوای ئەوەی بەهۆی ئەوانەوە هەواڵی ئەوەم دەزانی کە کورد ماوە و هاتووچۆکردن هەیە بۆ کوردستان، چونکە ئەوکاتەی بردمانیانە تۆپزاوا و ئەو هەموو خەڵکەم بینی لەوێ سجن بوون من وام دەزانی هەموو کوردیان گرتووە، کاتێ ڕۆژانە دەمبینی خەڵکیان لە تۆپزاوا سواری سەیارە دەکرد و دەیانبرد، ئەوکاتەی ئێمەشیان خستە ناو ئەو سەیارانەوە و بینیم چیان لە کەسوکارەکەم کرد و چۆن ئەو خەڵکەی لەگەڵ ئێمە بوون خرانەژێر خۆڵەوە، ئیتر باوەڕم وابوو هەموو کوردیان کوشتووە، بۆیە سەرەتا ئەو خەیاڵەم نەبوو بگەڕێمەوە بۆ کوردستان و وامدەزانی ئێستا هەموو کوردستان وەك ئەو بیابانەی چاڵەکانیان لێکردبوو بۆ کوشتنی ئێمە، ئاوا بووەتە چۆڵەوانی. بەڵام بەهۆی ئەوەی لەناو ئەم خێزانەدا و بەهۆی هاتووچۆی ماڵی براکانیانەوە هەواڵم دەبیست و باسی کورد و کوردستانیان دەکرد، مەیلی گەڕانەوەم لا دروست بوو. من لەوێ ئەوەم زانی کە عیراق و ئێران هەشت ساڵ شەڕیان بووە و لەوێ ئەوان باسی ئەوەیانکرد کە (هەڵەبجە) ئەوان پێیان دەووت

(حەلەبجە) بەکیمیایی لێی دراوە و پێنج هەزار کەسی کوشتووە. باسی ئەوەشیان دەکرد عیراق کوێتی داگیر کردووە و رەنگە شەڕی تر دروستبێت و ئەمریکا لە عیراق بدات، کاتێ ئەو شتانەم دەبیست دەترسام، دەمووت رەنگە وڵاتەکە واتێکبچێت قەت نەتوانم بگەمەوە کەسوکارم، لەوەش دەترسام کە بگەڕێمەوە بۆ کوردستان ئەگەر ئاشکرایش نەبم رەنگە جارێکیتر حکومەت ئەو خەڵکانەی ماوون بمانگرێتەوە و بمانهێنێتەوە لەم بیابانە بمانکوژێت، بەڵام تامەزرۆی بینینەوەی وڵاتی خۆمان و کەسوکارەکەم ئەوەندە زاڵ بوو بەسەرما ئەو مەترسیانە لێك نەدەمەوە و هەموو رۆژێ یەخەیان بگرم کە بمگەڕێننەوە ناو کەسوکارم.

ئەوان کاك فازڵ و کاك ساڵەح کوڕیان عەسکەر بوون، (کاك ساڵەح) عەسکەر بوو لە کوردستان، ئیتر خەیاڵی شەو و رۆژم بووبووە ئەوەی بتوانم بگەڕێمەوە و بەخەڵك بڵێم چیان لە کەسوکارەکانمان کردووە. ئومێدی ئەوەشم هەبوو ئەی کێ دەڵێت ئێستا باوکم نەگەڕاوەتەوە و بە هیوای هەواڵێکی ئێمە بێت. یان دەمووت خۆ ماڵی مامەکانم لە کەلارن و خزمم زۆر بوو لە سەرقەڵا و لە سمود، دەمووت بگەمەوە لای ئەوان و دەمەوێت لەگەڵ کەسوکارم بژیم. هیچی ترم لە بارەی کوردستانەوە نەدەزانی و هیچ هەستم بەوە نەدەکرد کە من بگەڕێمەوە ئیتر دەبێتە قسەو پرسیار لای خەڵك تەیمور چەند ساڵە لەکوێ بووە و چۆن رزگاری بووە و چۆن

گەڕاوەتەوە و ڕەنگە بەو هۆیەوە ئاشکرابم، هیچ هەستم بەو مەترسیانە نەدەکرد و تەنها ئاواتم ئەوە بوو بگەڕێمەوە ناو قەومەکەی خۆم.

ئیتر زوو زوو پێیانم دەووت حەز دەکەم بگەڕێمەوە ناو کەسوکارم، ئەوان سەرەتا پێمیان دەووت وەزع خراپەو بەوە بزانرێت چۆن رزگارت بووە خۆت و هەرچی کەسوکارت ماووون لە کوردستان و ئێمەش هەموومان تیا دەچین، لەبەر ئەوە خۆت بگرە و ئەوەتا لێرە وەك منالّی خۆمان چاومان لێتە و خوا گەورەیە تا دنیا بەلایەکدا ئەکەوێت لێرە بمێنەرەوە، بەڵام ئۆقرەم لێبڕابوو. بۆیە بڕیاریاندا هەوڵی ئەوە بدەن کە بزانن هیچ کەسێکم دەدۆزنەوە، وتیان با ئەمجارە (ساڵح) بێتەوە پێی دەڵێین بە دوای کەسوکارتا بگەڕێت. سێ چوار هەفتە جارێك کاك ساڵح دەهاتەوە و هەفتەیەك لەماڵ دەبوو سەرلەنوێ دەگەڕایەوە بۆ عەسکەری، ئیتر ئومێدی من بەسترایە گەڕانەوەی کاك ساڵحەوە و ڕۆژم دەدایە دەم یەك ودەمژمارد و هەر چاوم لە ڕێ بوو کاك ساڵح لە کوردستانەوە بگەڕێتەوە بۆ سەماوە.

- **ئەو کوڕەیان لە کوردستان لە کوێ عەسکەر بوو.؟**

– لە زاخۆ.

- **ئومێدت هەبوو لە زاخۆوە بتوانێ هەواڵی کەسوکاری تۆی دەستکەوێت لە گەرمیان.؟**

– من نەمدەزانی زاخۆ لە کوێیە، دوورە یان نزیکە لە کەلارەوە، ئەوەی گرنگ بوو بەلای منەوە ئەو لە کوردستانە و دەتوانێ کوردێك بدۆزێتەوە و پرسیاری کەسوکاری منی لێبکات.

- **کاك ساڵەح هیچ زانیاریەکی دەربارەی کەسوکاری تۆ هەبوو.؟**

– خۆی نەخێر، بۆیە چاوەڕێم بوو بێتەوە بۆ سەماوە و من زانیاری بدەمێ و ئەویش کە گەڕایەوە کوردستان پرسیاری ئەو زانیاریانەی من بکات. "کاك ساڵەح" گەڕایەوە بۆ ماڵ و پێیان ووت "عەلی" دەیەوێ زانیاری لەسەر کەسوکارەکەی بزانێت تا بتوانێت بچێتەوە بۆ لایان، رایان سپارد کوردێکی جێی باوەڕ بدۆزێتەوە تا قسەی لەو بارەیەوە لەگەڵ بکات. "کاك ساڵح" ووتی یەك کوردێکمان لەگەڵە ئەمجارە بچمەوە قسەی لەگەڵ دەکەم. هەندێ زانیاری لەسەر ناوی گوندەکەمان و نزیك چی شارێك بووە و خزم و کەسەکانم ناویان چیە، وەری گرت و گەڕایەوە بۆ عەسکەری. ئیتر لەو ساتەوە کە چووەوە بۆ کوردستان هەر دەپاڕامەوە خوا بکات کەسێك بدۆزێتەوە خەمخۆری کورد بێت و بە دوای کەسوکارما بگەڕێت. زۆر سەیرم لە ئیشی خوا دەهات من عەسکەری عەرەب گرتمی و هێنامیان لەم بیابانە کەسوکارمیان خستە ژێر خۆڵەوەو خۆشمیان بگرتایەتەوە

پارچە پارچەمیان دەکرد، کەچی وا ئێستاش هیوام بە عەسکەرێ عەرەبە بمگەڕێنێتەوە بۆ کوردستان.

"کاك ساڵەح" دوای ئەوەی کەسوکارەکەی و منیش داوامان لێی کرد هەوڵی دۆزینەوەی کەسێك بدات تا بەهۆیەوە کەسوکاری من بدۆزنەوە، ماوەیەکی پێچوو هەر دەیووت کوڕێکی کوردمان لەگەڵە هەندێ قسەمان کردووە بەڵام هێشتا ئەو سیقەیەم لا دروست نەبووە باسی ڕووداوەکەی تۆی بۆ بکەم، ئیتر ئەو ماوەیە بە قەدەر هەموو مانەوەم لە سەماوە لە دڵەڕاوکێ و چاوەڕوانیدابووم، تا جارێکیان هاتەوە و ووتی باسی ڕووداوەکەی تۆم بۆ کردووە و ناوی کەسوکارتم داوە پێی ئیشەڵا ئەمجارە تا دێمەوە کەسوکارت دەدۆزینەوە. من ناونیشانیماڵی پوورم لە سەرقەڵا و ناوی مامەکانم دابوو پێی کە لە کەلارن. ئەویش زانیاریەکانی منی دابووە کوڕە کوردەکە تا بچێت بیان دۆزێتەوە.

- **تۆ ناوی سەربازە کوردەکەت دەزانی.؟**

- ئەو کاتە نەخێر. بەڵام دواتر زانیم سەربازەکە ناوی " ئەسعەد حاجی حوسێن" بوو لە ئەسڵدا خەڵکی "دسکەرە" بووە لە ناوچەی شارەزور و ئەویش گوندەکەیان ڕوخێندراوە و ماڵیان برابووە ئۆردوگای "نەسر" لە نزیك عەرەبەت، باوکی ناردبووە سەرقەڵا و ماڵی پورمی دۆزیبووەوە و باسی منیان بۆ کردبوون، بەڵام ماڵی

پورم ترسا بوون و باوەڕیشیان نەکردبوو، بۆیە ناونیشانی ماڵی مامەکانمیان دابوو پێی لە کەلار. چوو بووە ماڵی مامم و ئەو زانیاریانەی لە ڕێی "کاك ساڵەح" ەوە دەستیان کەوتبوو بەسەرهاتەکەیان بە مامم وتبوو. ئیتر باوکی سەربازە کوردەکە "حاجی حوسێن" گەڕابووەوە و "کاك ئەسعەد"ی کوڕی چووبووەوە بۆ زاخۆ و هەواڵەکەی دابووە "کاك ساڵەح" کە مامەکانیم دۆزیووەتەوە و لە کەلار دادەنیشن. "کاك ساڵەح" گەڕایەوە بۆ "سەماوە" و ئەم هەواڵەی هێنایەوە، هەواڵێکی خۆش بوو بۆمن دوای زیاتر دوو ساڵ دابڕان و دوای ئەوەی باوکم و "مامە عومەر"م و "خاڵە عوسمان"م لە تۆپزاوا بە زۆر لێمان جیا کرانەوە و دایکم و خوشکەکانم بە بەرچاومەوە کوژران و ماڵی "پورم مەعسومە و حەمدیە" و ماڵی "خاڵۆ عوسمانم"و ماڵی "حاجی حەمەجان" و ماڵی "باجی پیرۆز" هەموویان کوژران، وامدەزانی کورد هەمووی تیاچووە و هەر من ماومەتەوە، بۆیە ئێستا وەك ئەوە وابوو هەموویان زیندوو بووبێتنەوە ئیتر خوا خوام بوو سەعاتێك زووتر بمگەیەننە ماڵی مامەکانم. "کاك ساڵەح" و براکانی دەیانووت بیر لەوە دەکەینەوە چۆن بتبەین و لە خۆمانەوە چۆن بتدەینە دەستی ئەوان تا دڵنیا نەبین کە ئەوانە مامی تۆن، پێم دەووتن ئێوە بمبەنەوە بۆ کەلار خۆم مامەکانم و خزمەکانم دەناسمەوە. بەڵام دیار بوو ئەوان بەو شێوەیە ڕازی نەبوون و لە ناوخۆیاندا وا تەگبیریان کردبوو کە

مامەکانم بێنن بۆ سەماوە لەوێ منیان پیشان بدەن. "کاک ساڵەح" جارێکی تریش چووەوە بۆ کوردستان و دیاربوو کەسوکاری کاتی گەڕانەوەیان دەزانی، وا رێککەتبوون بەهۆی ماڵی " کاک ئەسعەدی حاجی حوسێن" سەربازە کوردەکەوە مامەکانم بێنن بۆ سەماوە. ئەو رۆژەی کە دەبوو مامەکانم بێن منیان بردەوە بۆ گوندەکەی خۆیان بۆ (ئالعێشم) و منیان خستە ناو منداڵەکانی خۆیانەوە کە بەرەی حەوت برا بوون لە گوندەکە و منداڵی هاوتەمەنی منی زۆر بوو، لەناو خۆیاندا تەگبیری ئەوەیان کردبوو ئەوکاتەی میوانەکان دێن هەموو منداڵەکان لەگەڵ من بن تا بۆ ئەوەی دڵنیابن بزانن مامەکانم من دەناسنەوە، ئەوان ئەمەیان بە من نەووتبوو تەنها وتیان ئەمڕۆ خزمەکانت دێن بۆ ئێرە هەرکات گەیشتن تۆ یەکسەر نەڕۆی بۆ لایان. سەیارەیەك هاتە ناو ئاواییەوەو لە نزیکی ئەو شوێنەی ئێمە لێی کۆبووبووینەوە راوەستا، هەر کە لە سەیارەکە دابەزین "مامم عەلی و مامم عەزیز" م لە دوورەوە ناسیەوە.

- **بەتەنها هەردوو مامەکانت بوون، یان "کاک ئەسعەد"سەربازە کوردەکە و "کاک ساڵەح" یان لەگەڵ بوو.؟**

- هەردوو مامم عەلی و مامم عەزیز و کاک حاجی حوسێن باوکی سەربازە کوردەکە بوون، کاک ساڵەح هێنابوویانی.

- **کاتێ لە سەیارەکە دابەزین، تۆ چیتکرد.؟**

– من ئەوەم لەبیر بوو کە پێشتر بە منیان ووت تۆ مەچۆرە پیریانەوە، بەڵام خۆم پێڕانەگیرا و بە راکردن رامکرد بۆ لایان باوەشم پێیاندا کردبوو پڕ قورگم بوو بوو لە گریان و هەناسەم توونند بووبوو. ئەوانیش توونند منیان دەگوشیە خۆیانەوە و توشی سەرسوڕمان بوو بوون ئەم برازایەی ئەوان چی گەیاندوێتێ ئەم گوندەی لای سەماوە. ئەگەر پێشتر کاتێ هەواڵەکەیان زانیووە گومانێکیان هەبووبێت کە ئایا راستە "تەیمور" بە تەنها کەوتۆتە ماڵە عەرەبێکەوە و راڕابووبێتن لەوەی ئایا هەر بەڕاستی کوڕەکەی ئەوانە یان نا، ئەوە ئێستا زانیاریەکان راستن و "تەیمور" ماوەتەوە. ماوەیەکی زۆر یەکتریمان بەرنادا و هەر باوەشمان کردبووە یەکتریدا و هەرسێکمان ئەگریاین. تەماشام کرد ئەو زەلامانەی لە دەورمان بوون و تەنانەت منداڵەکانیش هەموویان چاویان دەسڕی، ئیتر نازانم بەزەییان پێماندا هاتبۆوە یان ئەوانیش وەك من لە خۆشیا دەگریان کە بە کەسوکارم گەیشتمەوە. مامەکانم قسەیان دەکرد و پرسیاریان لە من دەکرد بەڵام من هیچ تێنەدەگەیشتم چونکە زمانی کوردیم بیر چووبووەوە، منیش پرسیاری باوکمم لەوان دەکرد، پرسیاری نەنکمم دەکرد کە تا تۆپزاوا لەگەڵمان بوو، ئەوانیش عەرەبیان نازانی تەنها "مامم عەلی" کەمێك شتی بە عەرەبی دەزانی، بەڵام نەیدەزانی قسەی پێبکات حاڵی بووم دەیووت (نەنە لە کەلارە)، بەڵام بۆ باوکم هیچ قسەی ناکرد، ناوی باوکم و مامە عومەرم دەهێناو بە ئیشارەت دوو پەنجەم

دەخستە تەنیشت یەکترییەوە دەمویست تێبگەن مەبەستم لە باوکم عەبدوڵا و عومەری برایانە، کەچی هەر دەیانووت (نەنە، کەلار). تێگەیشتم کە هیچ لە بارەی باوکم و مامە عومەرەوە نازانن و رەنگە نەنکم گەڕابێتەوە بۆ کەلار، بەڵام بەلامەوە سەیر بوو چونکە ئێمە تا تۆپزاوا پێکەوە بووین و ئەو لەوێ لە ئێمە جیاکرایەوە، ووتم دیارە هەر ئەو رۆژە ئەویان گەڕانۆتەوە بۆ ئۆردوگا، دواتر بیرم دەکەوتەوە کە باوەڕ ناکەم ئەو نەنکەم بڵێن و رەنگە نەنە حەلاوم بڵێن دایکی دایکم. بە بینینی مامەکانم زۆر دڵخۆش بووم و دەزانم ئیتر کەسێك ماوە بمگرێتە خۆی و بتوانم بگەڕێمەوە لەگەڵیان بژیم، بەڵام لەو ساتەوەی ئەوانم بینی ئیتر دیمەنی باوکم و دیاکم و خوشکەکانم بەرچاومیان بەرنادا و دەهاتنەوە بەرچاوم، ئەو رۆژانەم دەهاتنەوە یاد کە هەموومان پێکەوە دەژیاین. زوو زوو دەستم بە گریان دەکردەوە، من گریانەکەم بەشێکی بۆ باوکم و دایکم و خوشکەکانم بوو چونکە دەهاتنە پێش چاوم، بەڵام ئەوان وایان دەزانی من بۆ مامەکانم دەگریم، ماڵە عەرەبەکە دڵیان ئەدامەوە ئەوە لە خوا بەزیادبێت کەسوکارت ماوون تۆ هەر خەمی ئەوەت بوو رۆژێك بتوانی بگەڕێیتەوە بۆ کوردستان و بیان بینیتەوە ئەوەتا ئێستا خۆیان هاتوون بۆلات. مامەکانیشم هەر ماچیان دەکردم و دەستمیان دەگوشی. زۆر وورد دەبوومەوە لەو پیاوەی تر وا لەگەڵیان هاتبوو، دەترسام ئەویش کەسێکی نزیکی خۆم بێت و نەیناسمەوە،

دەمویست پرسیاری ئەوە بکەم ئەم پیاوە کێیە لەگەڵتان بەڵام نەمدەزانی چۆن تێیان بگەیەنم، دیار بوو کاك ساڵەح هەستی بەوە کرد من دەمەوێ ئەو پرسیارە بکەم ئەو خۆی ووتی ئەمە باوکی کاك ئەسعەدە ئەو سەربازە کوردەی لەگەڵمدایە لە عەسکەری. مامم و ئەویشی بە خزمەکانی خۆی ناساند و نانی نیوەڕۆمان پێکەوە خوارد لە گوندی (ئەلعێشم) و دوای نان خواردن هەستان بڕۆنەوە و دەمزانی دەڵێن تەیمور دەبەینەوە، ماڵە عەرەبەکان رازی نابوون چونکە منیان زۆر خۆش دەویست بە مەرجێ رازی بوون بە منیان دەووت دەبێ مانگێ لە کوردستان بیت و مانگێ بێیتەوە بۆ لای ئێمە بۆ سەماوە. هەمویان منیان ماچ دەکرد خوا حافیزیمان کرد و سواری سەیارەکە بووین بگەڕێینەوە ئەمجارەش بینیم هەموویان ئەگریان و دەپاڕانەوە و دوعایان دەکرد بە سەلامەتی بگەینەوە کوردستان.

- **ئەوکاتەی مامەکانت هاتن سەیارەی خۆیان پێ بوو.؟**

— نەخێر سەیارەیەکی نەفەریان بە کرێ گرتبوو.

- **ئەی لەوە نەترسابوون ئەم سایەقە ئاشکرایان بکات.؟**

- من نازانم ئەوان لە کوێوە بەم سەیارەیە هاتبوون، بەڵام کە گەیشتنە گوندەکە ئەلعێشم سەیارەکە ئەوانی داگرت و ڕۆیی نەمایەوە تا بەو حاڵەی ئێمە بزانێت.

- **ئەی بە چی سەیارەیەک گەڕانەوە.؟**

- لە گوندەکەوە بە سەیارەی خۆیان هێنامانیان تا سەماوە و لەوێوە بە سەیارەی نەفەر هاتینە بەغدا و لەوێوە بۆ کەلار گەڕاینەوە.

- **هیچ ناسنامەیەکت پێبوو.؟**

- نەخێر.

- **ترسی ئەوەت نەبوو لە خاڵەکانی پشکنین دەستگیرت بکەن.؟**

- خۆی ئەوکاتە من تەمەنم 14 ساڵان بوو، دیاربوو منداڵ بووم، لەوە ناترسام کە ناسنامەم پێ نیە، مەترسیەکەم لەوەیا بوو کە من هیچ کوردیم نازانی و بە دسداشەیەکەوە لەگەڵ ئەم سێ پیاوە بووم ئەوان بە جل و بەرگی شەرواڵ و مرادخانی کوردییەوە و هیچ عەرەبییان نازانی. هەر کەسێك تەماشای بکردینایا بەلایەوە سەیر بوو کە ئەم سێ پیاوە کوردە و ئەم منداڵە (عەرەبە) بۆچی پێکەوەن. لەوە ئەترسام لە سەیتەرەکان بەو هۆیەوە بمانگرن. تەنانەت بەشی ئەوە لەیەك تێناگەیشتین مامە عەزیزم لەناو بەغدا دیاربوو دەترسا دەیووت (بێوەڕێ، بێوەڕێ) نەمدەزانی چی دەڵێت

به مامه عەلیمم ووت (شی گول هادە)، مامە عەلیم ووتی دەڵێ (ئمشی، ئمشی). کەفێری کوردی بوومەوە ئەوکات دەمزانی عەرەبیەکەی مامە عەلیم چۆنە، (بێوەڕێی لەمن کردبووە ئمشی). بەڵام لەخوا بەزیادبێت توشی هیچ کێشەیەك نەبووین و بە سەلامەتی گەیشتینەوە کەلار.

- **سەعات چەند لە ئالعێشم بەڕێکەوتن.؟**

– نازانم سەعات چەند بوو، بەڵام نانی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد و پاشان هاتینە سەماوە، عەسر بوو گەیشتینە بەغدا و ئیتر سواری سەیارە بووین بەرەو کەلار، حسابکە رێیەکە و چوونە گەراج و تا سەیارە پڕدەبوو بەهەمووی نازانم چەنی خایاندووە.

- **کاتێ پێش دوو ساڵ تۆ لە سەیارەی سەرداپۆشراودا لە کوردستانەوە بۆ ناو عەرەبستان دەبرایت بۆ گوولەبارانکردن، ئێستا هەستت چۆن بوو کە بە ئازادی دەگەڕێیتەوە بەرەو کوردستان.؟**

– وەڵا ئێستاش ئازاد نەبووم، لە رێگەش دەترساین دەستگیر بکرێین و دڵنیابووم لەوەی دەبێ هەمیشە بە دزییەوە بژێم چونکە هەرکاتێك حکومەت بە رووداوەکەی من بزانێ خۆم و لە هەرماڵێکیش بم ئەوانیش هەموو دەکوژرێن، بۆیە هەستم بەوە ناکرد کە بگەڕێمەوە

بۆ کوردستان ئیتر مەترسیم نامێنێ و ڕەنگە ئەو گوندەی ماڵە عەرەبەکان بۆمن ئەمینتر بوایا، بەڵام دڵم لەوێ ئیدارەی ناکرد و دەمویست بێمەوە. بەڵام ئەو کاتەی لە ڕێگە بووین تا زیاتر لە ئەلعێشم دوور دەکەوتمەوە زۆرتر بیری دایکم و خوشکەکانمم دەکرد چونکە ئەو دوو ساڵە لەبەر ئەوەی لەو ناوچەیەوە نزیك بووم کە ئەوانی تیا گوولەبارانکران وا هەستم دەکرد بەدیاریانەوەم و ئێستا لە ڕێگە هەستم وابوو لێیان دوور دەکەوتمەوە، وەك ئەوەی شتێك لە دڵی منەوە بەسترابێتە ناو گۆڕەکەیانەوە تا لێیان دوور دەکەوتینەوە زۆرتر دڵمیان رادەکێشا. ئەمزانی ئیتر من تا ئەو ڕۆژەی دەمرم ئاسودە نابم چونکە لایەکی دڵم هەر لە کوردستان دەبێت و لایەکی دەبەسترێتە بیابانەکانی سەماوەوە.

- **کەی گەیشتنە کەلار.؟**

— کاتەکەی نازانم بەڵام شەو بوو. دەزانم ئەوەنە درەنگ بوو سەیارە نەبوو پێی بچین بۆ (سمود) لە کەلارەوە بەپێ کەوتینەڕێ بۆ ماڵی مامەکانم لە ئۆردوگای سمود. لێرە لەسەر هەمان ئەو ڕێگایە بووین کە دوو ساڵ لەمەو بەر ئێمە هەموومان پێکەوە بووین باوکم و دایکم و من و خوشکەکانم، بەڵام ئێستا وا من بەتەنها دەگەڕێمەوە. هەمان جادە و هەمان ڕێگابوو، ئەوکات بە تەرەکتەر و ڕووەو کەلار پێیدا تێپەڕین و ئێستا من لە کەلارەوە بەرەو ئۆردوگای سمود بەپێ پێیدا

دەگەڕێمەوە، بۆ ئەو ئۆردوگایەی کە لە ملەسورەوە بە بەڵێنی سەرۆک جاشێك کەوتینەڕێ تا لەم ئۆردوگایە نیشتەجێ بین، ئێستا چارەنوس بە تەنها منی هێناوە بۆ ئێرە و خێزانەکەمان لە بیابان لە ژێر خۆڵدان.

- **یەکەم شەو لە ئۆردوگای سمود چوونە ماڵی کێ.؟**

– چووینە ماڵی مامم (ڕەووف).

- **ئەوان دەیانزانی ئێوە ئەم شەو دەگەڕێنەوە.؟**

– باوەڕناکەم زانیبێتیان، چونکە کاتێ مامم عەزیز و مامم عەلی هاتبوون، بە مامم ڕەوفیان وتبوو هەواڵێکی وا هەیە ئەچین بۆ سۆراغی، دڵنیا نەبوون لەوەی ئاوا بە ئاسانی من دەدۆزنەوە و ئاوا بە زوویی دەگەڕێینەوە.

- **کاتێ چوونە ماڵیان، ئەوان خەوتبوون.؟**

– نا، کە لە دەرگاماندا هاتن دەرگایان کردەوە و کە چووینە ژوورێشەوە منداڵەکانی بە خەبەر بوون. ئیتر سەرلەنوێ لە ماڵی مام ڕەوفیش گریان دەستی پێکردەوە و ئەوانیش کەوتنەوە قسەکردن لەگەڵم بەڵام منیش هەر نەمئەتوانی وەڵامیان بدەمەوە، ئەوان بە کوردی و من بە عەرەبی لەیەك تێناگەیشتین. مامم کوڕێکی هەبوو ناوی سۆران بوو هاوتەمەنی خۆم بوو جلی کوردی ئەویان بۆم هێنا

دسداشەکەم دانا و جلە کوردیەکەم کردەوە بەرم. تەماشای خۆمم دەکرد رۆژانی ئاواییم دەکەوتەوە یاد کە بەجل و بەرگی کوردیەوە بەردەوام لەگەڵ باوکم بووم، لەماڵەوە لە گەڵ دایکم و خوشکەکانم، منداڵە هاوتەمەنەکانی خۆم لە کوڵەجۆ دەهاتنەوە یادم. دەمویست قسە بکەم پرسیاری باوکم و مامە عومەرم و خاڵە عوسمانم و خزمەکان و خەڵکی ئاوایی و هاورێکانم، بەڵام نەمئەتوانی و ئەتووت زمانم بەستراوە، زۆر ناخۆش بوو دەمزانی ئەوانیش پرسیاری دنیایان لە من هەیە بەڵام ئەوانیش لە زمانەکەی من نازانن، وەك شێتم لێهاتبوو. هەرچۆنێك بوو ئەو شەوە لەوێ خەوتین و بۆ بەیانی کە رۆژ بووەوە چووین بەشوێن نەنکمدا (نەنە حەلاو) دایکی دایکم، نازانم پێیان وتبوو کە تەیمور گەڕاوەتەوە یان نا، بەڵام کاتێ هاتە ماڵەوە وەك شێت باوەشی پیاکردم و لە تاوا هاواری دەکرد، من نەمدەزانی ئەو دەڵێت چی و تەنها ئەوەندەم لە دەست دەهات کە منیش بگریم و باوەشی پیابکەم و زوو زوو دەستەکانی ماچکەم. کە باوەشی پێدا کردم بۆنی دایکمی لێدەهات کۆشی وەکوو کۆشی دایکم وابوو خەریك بوو هەر هاروشێت بم، پێش ئەوەی دەستگیربکرێین زۆرجار چووببومە کۆشی نەنکم بەڵام هیچ جارێکیان وەك ئەمجارە خۆش نەبوو. دەمزانی ئێستا ئەویش کە باوەشی بە مندا کردووە رەنگە وا هەست بکات کچەکەیەتی، دەمزانی ئێستا دەیەوێ سۆراغی کچەکانی و کچەزاکانی بزانێ، بەڵام هیچمان زمانی

یەکتریمان نازانی. پاش کەمێك (نەنکم زوبێدە)ش هات دایکی باوکم
ئەو تا تۆپزاوا پێکەوە بووین و لەوێ لەگەڵ پیرەکان جیاکرایەوە
لێمان، ئەویش ئەوەنەی تر ئازاری خستە دڵمەوە، ئەوان دیار بوو
ئەم دوو ساڵە ئەوەندە گریابوون بۆ بێسەروشوێن بوونی ئێمە لەسەر
گریان راهاتبوون فرمێسك بە چاویاندا رێی دەکرد، بەدیارمەوە
دانیشتبوون و دەیانلاوانەوە. بێ ئەوەی زمانی یەکتر تێبگەین
دەمزانی ئەوان بە بینینی من چی یادگاریەکیان بیرکەوتۆتەوە. بە
گەڕانەوەی من بۆ ناویان دووای زیاتر لە دوو ساڵ، ئێستا وەك ئەوە
وابوو هەواڵی مردنی کچ و کوڕەکانیان بزانن. من ئەوەم نەدەزانی کە
هیچ کەسێك هەواڵی ئەو هەموو خەڵکە دەستگیرکراوە نازانن و هەر
بەهیوای گەڕانەوەیانن، دوای ئەوەی فێری زمانی کوردی بوومەوە و
پێیان دەووتم هەموو رۆژێك هەر چاومان لە رێگە بووە تا هەواڵێکمان
دەستکەوێت، ئەگەر شەوێ درەنگ رەشەبا تەقەی لە دەرگامان
هەستانبێت دڵمان داخورپاوە و ووتومانە ئیشەڵا ئەوە هەواڵێکی
خێری کچ و کوڕەکانمانە. ئەگەر رۆژێك رێبوارێ رێی کەوتبێتە ئێرە
هەموومان دەورمان داوە و ووتوومانە ئیشەڵا لای ئازیزانی ئێمەوە
هاتووە. هەرجارێ دیعایەیەك لەناو خەڵکا بڵاو بووبێتەوە (سەدام)
عافوات دەدات و زیندانیەکان بەر ئەبن، لەخۆشیا وەك ئەوەی تازە
لەدایك بینەوە ئاوا بەهیواوە ژیاوین.

- **تۆ پێت ووتن هەموویان گوولەبارانکراون.؟**

- بەڵێ کە زمانە کوردیەکەم بیرکەوتەوە هەمووم بۆ گێڕانەوە. گەڕانەوەم بۆ ناو کەسوکارەکەم بۆ من دەستپێکردنی ژیانێکی سەخت و ناخۆش بوو وەك دۆزەخ وابوو بۆم. لە ئەلعێشم و لە سەماوە کە خولیای گەڕانەوە بووم بۆ کوردستان خەیاڵم بۆ ئەوە نەدەچوو ژیانم پڕ دەبێت لە ناخۆشی و دەبمە مایەی بێهیواکردنی هەزاران کەس. زۆر ناخۆش بوو کە دەمزانی ئیتر بەهۆی گەڕانەوەی منەوە ئەوان بێ ئومێد دەبن لە گەڕانەوەی ئازیزەکانیان، پێشتر ئەوەم نازانی و وا هەستم دەکرد کە بگەڕێمەوە بۆ کەسوکاری ئەو هەموو خەڵکە بێ سەروشوێنە گرنگە کە بزانن چی بەسەر دەستگیرکراوەکانیان هاتووە، بەڵام ئەوان تەنها بەهیوای گەڕانەوەی کوڕو کچ و خوشك و براکانیانەوە مابوونەوە لە ژیان. بۆیە گەڕانەوەی من بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانزانی من گەڕاومەتەوە بێهواکردنیان بوو لە بەیەك گەیشتنەوەی خۆشەویسترین کەسیان. بۆیە بە درێژایی رۆژگار زۆر خەفەتم دەخوارد، لەلایەك دەمزانی بە بینینی من ئەوان برینیان دەکولێتەوە و کاتێ منیش لەناو ئەواندا بووم خەفەتم بۆ لە دەستچوونی خێزانەکەی خۆم دەخوارد. هەستم دەکرد چوارچێوەی ئەم دیوارانە ئازارم دەدەن، دەموویست بچمە دەرەوە، بۆ سەر کۆڵان بۆ ناو ئۆردوگاکە، کەچی ماڵی مامەکانم نەیاندەهێشت لە ماڵ دەرچم، خوایە گیان بۆ دەبێت بەشم هەر ئەوەبێت وەك سجن لە ماڵەوە بم، لێرەش سەرەتا واتێگەیشتم

بەهۆی ئەوەوەیە کە هیچ شوێنێك شارەزانیم و هێشتا فێری کوردی نەبوومەتەوە رەنگە لەبەر ئەوەیان بێت بزر نەبم، کەچی دواتر تێگەیشتم لێرەش بۆ من و بۆ ئەوانیش مەترسیە ئەگەر بچمە دەرەوە و خەڵك بمبینێ و بزانن لە ئەنفال گەڕاومەتەوە. هەرچەندە لە ئۆردوگای سمود کەسی تیانەبووە کە کەسوکارم لێی بترسن تا خەبەر بداتە حکومەت، بەڵام بەهۆی ئەوەی هەمووی هەر کەسوکاری ئەنفال بوون و زۆرێك لە ئەندامانی خێزانەکانیان بێ سەروشوێن بوون و هەموو ئەو خەڵکە بە هیوای گەڕانەوەیان بوون، بۆیە ئەگەر خەڵکەکە بیانزانیایا من یەکێك لەوانەم کە ئەنفال کراوین و ئێستا بە زیندوێتی هاتوومەتەوە بۆ ناو ئۆردوگاکەی ئەوان، ئەوە تەنها سەعاتێك بەس بوو بۆ ئەوەی هەموو ئۆردوگاکە بۆ هەواڵ بڕژێنە سەر ماڵی مامەمدا و بەو هۆیەوە حکومەتیش بیزانێت. لەبەر ئەوە مامەکانم هەقیان بوو من بە شاراوەیی بهێڵنەوە و ناچاربن لە کونجی ماڵەوە بمهێڵنەوە.

- **ئێستا چەند کەس لە خزمەکانی خۆت بەوەیان دەزانی تۆ گەڕاویتەوە.؟**

– سەرەتا تەنها مامەکانم و هەردوو نەنکم و ئامۆژنم و ئامۆزاکانم، مەترسیەکە ئەوەندە زۆر بوو دەترسان لەوەی بە کەسوکارەکەی خۆشم بڵێن. تەنانەت ماوەیەك بوو گەڕابومەوە بە خاڵۆکانمیان

نەووتبوو کە برای دایکم بوون، ڕۆژێك بردمیان بۆ کەلار بۆ بازاڕ تا ڕەسمم بگرن، نازانم دەیانویست جنسیەم بۆ بکەن نازانم چی بوو، لەناو بازاڕی کەلار خاڵۆم (عەلی) و کوڕەکەیمان بینی (حەیدەر)ی کوڕی لە لادێ زۆر هاوڕێ بووین ئەوان بەوەیان نەزانی بوو من بەو جۆرە ڕزگارم بووە و گەڕاومەتەوە کاتێ منیان بینی وەك شێتیان لێهات ئەوەنە سەریان سوڕما، چونکە ئەوان دەیانزانی زیاتر لە دوو ساڵە ئێمە بێ سەروشوێنین، بۆیە دەرکەوتنی من بەو جۆرە و لەناو بازاڕی کەلار لە بەرچاویان وەك خەون وابوو. کاتێ قسەشیان لەگەڵم دەکرد تازە خەریك بوو فێری وشە وشەی کوردی دەبوومەوە ئەوەنەی تر حەپەسان، بەو هۆیەوە بەشێکی تر لە خزمەکان زانیان گەڕاومەتەوە و ئیتر دەهاتن و پرسیاری خەڵکەکەیان دەکرد و من چۆن ڕزگارم بووە، خەریك بوو خەڵکێکی زۆر بەوەیان دەزانی کە ئێستا تەیمور لە ئۆردوگای سمودە. کەمتر لەمانگێ دەبوو گەڕابوومەوە تەواو زمانی کوردی هاتەوە ناو مێشکم و ئیتر ئەوەی لەو دوو ساڵەدا بەسەرم هاتبوو ئەوەی بینیبووم هەموویم بۆ مامەکانم باسکرد. ئەوەندەی تر هەستیان بە مەترسی ئاشکرا بوونی من دەکرد، دەیانزانی ئەم قسانە بڵاوبێتەوە لە گەرمیانا دەبێتە کارەسات. کەسێکیش لەناو خزماندا نەبوو بتوانێ ڕێیەکمان بۆ بکێشێت چی بکەین ئەوەندە هۆش و بیرمان نەبوو کە بزانین چۆن چارەسەری من بکەن. شەوێك مامە ڕەوفم ووتی بەخوا تەیمور لەوە

ئەچێ پیاو خراپ و شتی وا زانیبێتیان تۆ گەڕاویتەوە بیستوومە کەوتونەتە چاودێریمان، کوڕێکی مامم شوان بوو هەر لە ئۆردوگای سمود مەڕومالاتیان هەبوو، وایان بە باش زانی من لەگەڵ (سەردار) بچم لەگەڵ رانەکەیا و ببم بە شوان. ماوەیەك بەخوا نازانم دوو هەفتە یان سێ هەفتە دەبوو رۆژانە لەگەڵ خۆرکەوتنا من و سەردار دەچووین بۆ لای مەڕو دوای خۆرئاوابوون دەگەڕاینەوە، نازانم ماڵی مامەکانم چۆن ئەوەیان زانی بوو کە کابرایەکی جاش هەبوو بیستبووی منالێك لە سمود گەڕاوەتەوە بەلام نەیزانی بوو لە بنەماڵەی کێ یەو خەڵکی کوێیە، کەتبووە تاقیبات لەناو ئۆردوگاکە، موختاریان راسپاردبوو بگەڕێت زانیاریەکی لەو بارەیەوە دەستکەوێت. ئەمە هەڕەشەو مەترسیەکی گەورەبوو ئەگەر بەهەر جۆرێك بیانزانیایاو منیان بدۆزیایەتەوە ئەوە بە دڵنیایەوە هەموو کەسوکارم ئەوەی لە ئەنفالیشدا رزگاری بوو بوو تیائەچونەوە و ئەو ماڵە عەرەبانەی سەماوەش ئاشکرا دەبوون. سەرمان لێشێوابوو نەماندەزانی پەنا بۆ کوێ بەرین، ئێستا نەك هەر خۆم دەمزانی کەسوکاریشم هەستیان وایە کە گەڕانەوەی من بۆیان بووەتە بەلا، زۆر ناخۆش بوو بۆ من خۆزگەم دەخواست هەر رزگار نەبوایام و منیش لەگەڵ دایکم و خوشکەکانم لەوێ بمردمایا، دەمووت خۆزگە ئەو کچە چۆن بە زیندوێتی لە چاڵەکە نەهاتە دەرەوە منیش لە ترسی جوندیەکان بمامایەتەوە تا شۆفڵ خۆڵی دەکرد بەسەرمداو

دەمردم. بەس نەبێت نابوومە مەترسی بۆ کەسی تر، بەس نەبێت نابوومە هۆی بێئومێدکردنی کەس لە گەڕانەوەی کچ و کوڕەکانیان. نازانم ئایا مامەکانم خۆیان وا بیریان کردبۆوە یان کەسێك ڕێی بۆ کێشابوون بچن بۆلای (لالە سەرحەد خەلیفە یونس) ئەو سەرۆك عەشیرەتی روغزایی بوو، ئێمەش جافی روغزایی بووین. چووبوون پەنایان بۆ ئەو بردبوو وەزعەکەیان بۆ گێڕابووەوە، دیار بوو ناوی جاشەکە و موختارەکەیان پێی دابوو، لالە سەرحەد وەك هەڕەشە جوابی بۆ ئەو جاشە و بۆ موختارەکە ناردبوو واز لەو مەسەلەیە بێنن و قوڕ مەکەنە سەر کەسدا ئەوانە خزمی منن، دیار بوو ئەوانیش لەوە ترسابوون چونکە لالە سەرحەد خزم و کەسی زۆر بوو، ئیتر ماوەیەك هیچ دەنگوباسێك نەما. بە مامەکانیشمی ووتبوو ئەگەر پرسیاریان لێتانکرد چۆن گەڕاوەتەوە بابڵێت لەڕێگە لە سەیارە خۆی بەرداوەتەوەو ئەم چەند ساڵە لە بەغدا لە مەتعەم ئیشی کردووە. ماوەیەکی پێچوو ڕۆژێك لە دەرگا درا کە دەرگایانکردەوە عەسکەرێك بوو وتبووی هاتووم بۆ لای تەیمور، هاتە ژوورەوە سەرەتا زۆر ترساین و وتمان رەنگە ئیخباری کرابێتین، بەڵام هەر زوو ناسیمەوە کاك فازڵ بوو کوڕی ئەو ماڵە عەرەبەی سەماوە کە منیان گرتبووە خۆیان. زۆرم پێخۆش بوو هاتبوو بۆ میوانیمان. ووتی وەحدەی سەربازییەکەمان گوازراوەتەوە بۆ کەلار و پرسیاری ئۆردوگاکەم کردووە و لێرەش بە هەواڵپرسین ماڵی مامەکانتم دۆزیووەتەوە،

هەندێ دیاری هێنابوو کچەکانی خۆیان دروستیان کردبوو مەدایا بوو بە زەنگیانە چنیبوویان، کاک فازڵ ووتی ماڵەوەمان زۆر بیرت دەکەن و ئەم چەند مانگە دڵمان هەر لەلات بووە دەترساین توشی کێشەیەک بووبیت. داوای کرد کە گەڕایەوە بۆ سەماوە منیش لەگەڵی بچمەوە بۆ لای ئەوان و دواتر خۆی دەمهێنێتەوە، زۆرم پێخۆش بوو هەرچەندە لەو رۆژەوەی گەڕابوومەوە کەوتبوومە ناو ترس و ناخۆشیەکەوە ئەوانم بیر نەمابوو، بەڵام بە بینینی کاک فازڵی برای کاک ساڵەح یادگاریەکانی ئالعێشم و سەماوەم کەوتەوە یاد و حەزم دەکرد بچمەوە سەرێکیان بدەم، داوام لە مامم کرد رێگەم بدەن لەگەڵ کاک فازڵ بچم. رازی بوون و دسداشەکەم کردەوە بەرم و لەگەڵ کاک فازڵ چووینە کەلار و لەوێوە بۆ بەغدا و پاشان چووینەوە بۆ سەماوە، ئەوانیش زۆریان پێخۆش بوو کە گەڕاومەتەوە بۆ لایان.

- **هەر چوونە سەماوە، یاخود چوویتەوە بۆ گوندەکە "ئالعێشم" و سەردانی هەموو ئەو ماڵانەت کردەوە کە دەتووت لە هەموو ماڵێکیان وەک کوری خۆیان تەماشامیان دەکرد.؟**

– بەڵێ چوومەوە بۆ گوندەکەش و سەردانی هەموویانم کرد، بەڵام کاک غانم ئەو پیاوەی یەکم شەوی رزگار بوونم بردمیە رەشماڵەکە، نەمبینی وابزانم وتیان لە ترسا رایکردووە بۆ حدود سعودیە چونکە سەربازی فیرار بوو. دوای 21 ساڵ لە ساڵی 2009 لە سەماوە

بینیمەوە. جارێکیتریش ئەو کاتەی لە ئەمریکا بووم چەند ساڵێك پێش رووخانی سەدام لە ئەمریکا کاك فازڵم بینییەوە و ئیتر بەهۆی ئەوەوە زیاتر ئاگاداری خزمەکانی بووم و تێکەڵاویمان زیاتر دروست بوو، دوو کچیانم راکیشا بۆ ئەمریکا، لە 2009 جارێکیتر چوومەوە بۆ سەماوە و چووینەوە سەر گۆڕەبەکۆمەڵەکان و ئیتر تا ئێستا هاتووچۆمان هەیە.

- **ماوەی چەند رۆژ لە سەماوە مایتەوە.؟**

– ماوەکەی رەنگە سێ هەفتە بۆ چوار هەفتەی خایاندبێت لە سەماوە مامەوە و کە گەڕامەوە بۆ کەلار و ئۆردوگای سمود. ئەوەنەی پێنەچوو ئەوە بوو راپەڕین بەرپابوو کاتێ سمود و کەلار رزگارکرا و دواتر ووتیان ئەوە دوز و کەرکوکیش رزگار بووە، باسی ئەوە دەکرا شارەکانی خوارووی عیراقیش راپەڕینیان کردووە زۆرم پێخۆش دەمووت خەڵك دەبەمە سەر گۆڕەبەکۆمەڵەکان و تەرمەکانیان دەردەکەین و دەیانهێنینەوە، بەڵام زۆری نەخایاند راکەڕاك دەستی پێکرد و ئاوارە بووین حکومەت هاتەوە و شارەکانی گرتەوە، من زۆر دەترسام چونکە ئەو ماوە کەمەی شارەکان ئازاد بوون ئیتر بۆ خەڵکم دەگێڕایەوە ئەنفالەکان چیان بەسەر هاتووە و خەڵك دەیزانی من لە ئەنفال گەڕاومەتەوە و دەمزانی حکومەت چەند دڕندەیە بۆیە رەنگە لە هەموو کەس زیاتر ترسابێتم. رامانکردە ناوچەی شارەزور

و دواتر لەوێش ئاوارەی ئێران بووین و چووینە ئۆردوگایەك ناوی (چاڵەڕەش)بوو. ماوەیەك لەوێ بووین ژیان و گوزەرانمان زۆر خراپ بوو دەستمکرد بە کەسابەت شەکرو چامان دەفرۆشت و خۆمان سەرقاڵ کردبوو بە کارکردنەوە، مامم بانگی کردم ووتی پێمیان ووتووە تەیمور لێرە وەزعی خراپە با لێرە نەبێت لە ئۆردوگا، ناردمی بۆ (سەرتەکی بەمۆ) ئامۆزایەکم ناوی جەلال بوو لای کاك عوسمانی حاجی مەحمود پێشمەرگە بوو، منیش چووم و لەگەڵ ئەوان بووم بە پێشمەرگە. ماوەیەك لەگەڵ ئەوان مامەوە، پیاوێکی لێبوو ناوی (کاك ساڵەح گۆڕەسپی)بوو، ئەویش هەر مەسئولیاتی هەبوو زۆر رێزی دەگرتم و هەستم دەکرد وەك برازای خۆم سەیرم دەکات.

- **کەی لە راگەیاندنەکانەوە ئەم باس و بەسەرهاتەی خۆت بۆ یەکەمجار گێڕایەوە.؟**

– مەبەستت لەوەیە کەی چاوپێکەوتنم کرد.!

- **بەڵێ، یەکەم چاوپێکەوتنت کەی و لە کوێ بوو.؟**

– وەڵا بە دیاریکراوی نازانم، بەڵام چاوپێکەوتنم زۆر کردووە. بەتایبەتی دوای ئەوەی حەوت هەشت مانگێك لەوێ مامەوە دیار بوو بەسەرهاتەکەی منیان گەیاندبووە مام جەلال و داوایانکرد بچم لە قەڵاچوالان لە ماڵی مام جەلال بژیم. چووم بەڵام ئەو ماوەیە مام

جەلال لە شەقلاوە بوو منیان لە قەلاچوالان هێشتەوە و چاودێریان دەکردم لەوێش پیاوێك هەبوو بەناوی (هێمنە رەش) ئەو کاك هێمنە بردمیە لای خۆی بارەگاکەی هەر نزیکی ماڵەکەی مام جەلال بوو، زۆر یارمەتیدەرم بوو دڵمی دەدایەوە و لای ئەو مامەوە تا مام جەلال هاتەوە لە شەقلاوە، ئیتر بردمیانەوە بۆ ماڵی ئەوان و مام جەلال خۆی بینیمی سەرەتا ووتی من ئەوەم بیستووە تۆ لەگەڵ کەسوکارت ئەنفال کراویت و دواتر رزگارت بووەو ماڵە عەرەبێك تۆیان گرتۆتەخۆ و ماوەیەکە گەڕاویتەوە، خۆت بۆم باس بکە بزانم ئەم بەسەرهاتە چۆنە. منیش هەرچەندە زۆر شەرمم لە مام جەلال دەکرد بەلام شتەکانم بۆی گێڕایەوە پێمی ووت تۆ دەبێت لەماڵ ئێمە بمێنیتەوە من وەك کوڕی خۆم سەیرت دەکەم، تۆ شایەتێکی گرنگی پێویستە بتپارێزین رۆژێك دێت سەدام دەدرێتە مەحکەمە تۆ دەبیتە شایەت لەسەری لەبەر ئەوە دەبێت هەر لەماڵەکەی من بیت. ئیتر ماوەی نزیکەی پێنج ساڵ لە ماڵی ئەوان مامەوە و وەك کوڕی ئەو ماڵە وابووم مام جەلال خۆی و هیرۆخان زۆر رێزیان دەگرتم. زۆرجار وەفدی ئەوروپی و ئەمرکیی و عەرەب دەهاتن بۆ لای مام جەلال منیشی بانگ دەکرد و دادەنیشتم بە میوانەکانی دەووت ئەو کوڕە منالە هەموو کەسوکاری لە ئەنفال لەلایەن سەدامەوە گوللەبارانکراون لە گۆڕی بەکۆمەڵدا. باسی سەرگوزشتەی منی بۆ دەکردن و ئەگەر ئەوانیش پرسیاریان بکردایا مام جەلال خۆی

پرسیارەکانی بۆ دەکردم بە کوردی و وەڵامەکانی منی بۆ ئەوان تەرجەمە دەکردەوە. هەندێ جار ئیعلام بهاتایا بۆ مقابەلەی خۆی، بانگی منیان دەکرد و بەسەرهاتەکەی منی بۆیان باس دەکرد، داوای دەکرد ئەوەتا مقابەلەی بکەن. هەستم دەکرد مام جەلال دەیەوێ هەموو دونیا بزانن سەدام چی بەرانبەر بە کورد کردووە، ئەیویست ئەنفال بە جیهاندا بڵاو بێتەوە. تازە چووبوومەماڵی مام جەلال تیمێك لە ئەمریکاوە هاتن (میدڵ ئێست وۆچ) رێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ بوون ئەوان چاوپێکەوتنیان لەگەڵم کرد "یۆست هیلتەرمان" چاوپێکەوتنەکەی کرد، وابزانم خۆشت دەیناسیت. هەر ئەوکاتانە بوو کەنعان مەکیە هات و چاوپێکەوتنی لەگەڵم کرد، ئیتر زۆر کەناڵ و رۆژنامەی ئەورووپی دەهاتن بۆ لای مام جەلال و مقابەلەی منیشیان دەکرد.

- **ساڵی چەند بوو مام جەلال پێی وتیت رۆژێك دێت سەدام دەدرێتە مەحکەمە.؟**

- ئەو رۆژە بوو کە بۆ یەکەمجار بوو مام جەلال ببینم، لەماڵی خۆیان لە قەلاچوالان، ساڵەکەی نازانم کۆتایی ساڵی 1991 بوو ئەگەر سەرەتای 1992 بوو.

- **کاتێ مام جەلال پێی ووتبیت رۆژێک دێت سەدام دەدرێتە مەحکەمە و تۆ دەبیتە شایەت لەسەری، هەستت چۆن بوو لەو کاتەدا.؟**

– راستیت دەوێ، وەڵا هیچ کات لەو باوەڕەدا نەبووم ئەو رۆژە بێت، تەنانەت جارێکیتریش لە ساڵی 1997 لە ویلایەتی ڤێرجینیا لە ئەمریکا دکتۆر بەرهەم ئەو قسەیەی کردەوە وابزانم ئەیانویست مقابەلەیەکم بکەن و منیش رازی نابووم، دکتۆر بەرهەم ووتی تەیمور ئەم زانیاریانەی تۆ گرنگن و پێویستە بنوسرێنەوە رۆژێك دێت سەدام دەدرێتە دادگا و دڵنیابە تۆ دەبیتە شایەت لەسەری، بەڵام ئەوەی راستیبێت لە هەردوو جارەکەدا گاڵتەم پێدەهات. نازانم مام جەلال و دکتۆر بەرهەم چۆن ئەو تەسەورەیان هەبوو، ئایا لە خۆیانەوە وایان ووت یان پێشبینیان کردبوو. دواجار ئەوەی ئەوان راست دەرچوو سەدام دادگایی کراو منیش لە هۆڵی دادگا بوومە شایەت لەسەری.

- **چۆن چوویتە ئەمریکا.؟**

– ساڵی 1992 ئەو تیمەی (میدڵ ئێست وۆچ) کە چاوپێکەوتنیان لەگەڵم کرد، چووبوونەوە لە ئەمریکا وەك راپۆرتی رێکخراوەکە بڵاویان کردبۆوە، بەو هۆیەوە ئێستا ئەوە لە هەموو لایەك دەزانرا کە من لە ئەنفال رزگارم بووە و زانیاریەکانم لەسەر کوشتنی ژن و منداڵی ئەنفالکراو بڵاوکردۆتەوە، ئیتر کە رووداوەکانی شەڕی ناوخۆ گەیشتە

ئەوەی حکومەت هەولێری گرتەوە، دیار بوو ئەو رێکخراوە هەستیان بە مەترسی ژیانی من کردبوو کە ئیتر ناگونجێت لە کوردستان بژیم، ئەوکاتە بوو کە ئەوانەی لە رێکخراوەکانی سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکان و هەندێ رێکخراوی خێرخوازی کاریان دەکرد هەموویان گوێزرانەوە بۆ ئەمریکا، نازانم چۆن ئەوەیان کردبوو کە منیش لەگەڵ ئەوان بەرن بەڵام لە رێگەی پەیوەندیەکانی یەکێتییەوە کە من تا ئەوکاتەش هەر لەماڵی مام جەلال بووم، ئاگادار کرام کە دەبرێین بۆ ئەمریکا، رەسم و ناسنامەیان لێمان وەرگرت و ماوەیەکی کەم دوای ئەوە وابزانم رۆژی 1996/12/12 بوو بە سەیارە لە سلێمانییەوە بردمانیان بەرەو تورکیا. سەرەتا من زۆر دەترسام و دەمویست بەو جۆرە نەڕۆم چونکە من ماوەی پێنج ساڵ بوو لەماڵی مام جەلال بووم و وەك کوڕی ئەوان وابووم، شەڕی ناوخۆی نێوان پارتی و یەکێتیش گەیشتبووە رادەیەکی زۆر خراپ بۆیە بەڕاستی دەترسام بەو هۆیەوە لە سنوری پارتی دەستگیرم بکەن، بەڵام دیار بوو رێکخراوەکە خۆیان قسەیان لەگەڵ پارتیش کردبوو دەربارەی من. زۆر دڵنیایان کردم کە مەترسی ناکەوێتە سەرت و دەبێت هەر لەو رێگەیەوە بچیتە تورکیا، چونکە ئەوکات مەتار و شتی وا نەبوو هیچ رێگەیەکی تریش نەبوو بەناچاری و پشت بەخوا رۆیشتم، چەند کەسێکی تریش پێکەوە بەڕێخراین بەرەو تورکیا، من ئەوانم نەناسی بەڵام ئەوان ناوی منیان بیستبوو بە رووداوەکەی منیان دەزانی، من

لەوێ زانیم کە ئەوانیش وەك من لە گۆڕی بەکۆمەڵ رزگاریان بووە و هەمان رێکخراو (میدڵ ئیست وۆچ) لە ساڵی 1992 چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەوانیش کردووە و ئێستا ئەوانیش وەك من ئەو رێکخراوە دەیانبات بۆ ئەمریکا.

- **کێ بوون ئەوانەی تر کە وەک تۆ لە ئەنفال رزگاریان بوو بوو.؟**

- ناڵێم من ئەوکاتە ئەوانم نەدەناسی، دواتر ئاشنای یەك بووین، ئەوانیش کاك عەزیز و کاك واحید و کاك رەمەزان بوون، ئەوان بە خێزان و منداڵەوە هاتبوون و منیش هەر خۆم بووم. کاتێ گەیشتینە ناو خاکی تورکیا لە (سلۆپی) هەمان ئەو تیمەمان بینییەوە کە ساڵی 1992 لە کوردستان چاوپێکەوتنەکەیان لەگەڵم کردبوو، ئەوان لە سلۆپی چاوەڕوانی ئێمەیان دەکرد، دیار بوو ئەوان من و ئەو سێ کەسەی تریشیان دەناسی هاتنە پیریمانەوە. (یۆست هێڵتەرمان) خۆی هاتبوو بۆ پێشوازیمان. ئیتر بەو شێوەیە لە رێگەی تورکیاوە و بە فڕۆکە بردمانیان بۆ ئەمریکا. یەکەمجار چووینە (گوام) من تا ساڵی 1997 لەوێ بووم و دواتر گواستمیانەوە بۆ (واشنگتۆن دیسی) لە (ڤێرجینیا). ئا بیرم نەبوو دوای ئەوەی ئێمە گەیشتبووینە ئەمریکا بەخوا وابزانم دوو ساڵ دەبوو لەوێ بووین کەسێکی تریشیان هێنا هەر خەڵکی ئەم گەرمیانە بوو ناوی (کاك فەرەج) بوو ئەویش وەك کاك عەزیز و واحید و رەمەزان لە گۆڕی بەکۆمەڵی گەنجەکان

گەڕابوونەوە. تا چەند ساڵێکیش بەردەوام داوام لێیان دەکرد ئەوەی بەسەریان هاتووە بۆم بگێڕنەوە.

- **بەسەرهاتی خۆیان بۆ باس دەکردیت.؟**

– بەڵێ زۆریش.

- **ئەوەی بۆت دەرکەوت شێوازی گوللەبارانکردنەکان وەک یەک بوون.؟**

– نەخێر بەشێوەی جیا جیا بووین. ئەوان کاک فەرەج دەیووت دوو کەس دوو کەس دەستیانیان پێکەوە بەستووە و ڕەمیان کردوون ئەوکات خراونەتە ناو چاڵەکانەوە، کاک عەزیزو ئەوانیش هەرسێکیان پێکەوە بووبوون هەر لەناو سەیارەکە تەقەیان لێیان کردبوو، ئەوەی ئێمە هەموومانیان خستە ناو چاڵەوە و دامانیان نیشان و پاشان دەستڕێژی گوللەیان کردە ناوماندا. بەڵام من دەمویست بە هۆی ئەو گێڕانەوەیانەوە هەواڵێکم لەسەر باوکم دەستکەوێت.

- **هیچ زانیاریەکت دەستکەوت.؟**

– لەسەر چارەنوسیان بەڵێ، بەڵام بە دیاریکراوی لەسەر باوکم هیچم دەست نەکەوت. ئەوەی ئەوان باسیان دەکرد زۆر روون بوو کە هەموو گەنجەکانیان بەخێرایی گووللەباران کردووە. بەڵام ئەوان لەبەر ئەوەی کەسیان پێشتر باوکمیان نەناسیووە ئەگەر لەگەڵیشیان

بوویێت نەیان دەزانی باوکی من بووە. ئەیانووت خەڵکی هەموو ناوچەیەکی تیابووە، وەك باسیان دەکرد ئەوانیش هەر لەو سەروبەندەیا بووە کە باوکم و مامە عومەرم و خاڵۆ عوسمانم لە تۆپزاوا لە ئێمە جیاکرانەوە.

- **لە ئەمریکا هیچ مقابەلەیەکی تریان کردن.؟**

– ئەوان نازانم بەڵام من مقابەلەم زۆر کرد چی بۆ کەناڵی تەلەفزیۆنی و بۆ رادیۆ و بۆ رۆژنامەو گۆڤارەکان، هەروەها بۆ زۆر کۆڕ و کۆبونەوەش بانگ دەکرام و دەچووم لەوێ بەسەرهاتی ئەنفالم دەگێڕایەوە، ئەمریکا پێویستی بەو قسانەی ئێمە بوو تا سەدام وەك تاوانبار و مەترسیەك پیشان بدات و ئێمەش پێویستمان بەوە بوو کە جیهان بزانێت کورد لەسەر دەستی سەدام و رژێمەکەی چی بەسەر هاتووە، لەبەر ئەوە مقابەلەم زۆر دەکرد، چوومە کۆنگرێسی ئەمریکا و ئەوەی بینیبووم و بەسەرم هاتبوو بۆ کۆنگرێسمانەکانم باس دەکرد، چەندینجار دەچوومە رێکخراوەکانی تایبەت بە مافی مرۆڤ و جالیەی عەربی و ئەرمەنی و تەنانەت دەچوومە کەنیسەش بەشداری کۆڕو دیدارەکانیان دەبووم بۆ ئەوەی ئەنفال بناسێنم. لەساڵی 2004 کە ئەوکاتە هەڵمەتێك لەناوخۆی ئەمریکا هەبوو دژی چوونی ئەمریکا بۆ عیراق، حکومەتی ئەمریکا لەو ساڵەدا دەیان بەرنامە و کۆڕی بۆم رێکخست دەیانویست بە گێڕانەوەی رووداوەکانی ئەنفال و

چیرۆکی رزگاربوونی من سەرنجی شەقامی ئەمریکی راکێشن بۆ پشتیوانی حکومەت لە رووخاندنی عیراق. تەنانەت کۆلن پاوڵ خۆی بانگێشتی کردم و لە مونازەرەیەکدا پێشکەشی ئامادەبوانی کردم ئەو قسانەی کۆلن پاوڵ کردی لە ناساندنی من و باسکردنی ئەنفال بۆ کورد گرنگ بوو، پاشان داوای لەمن کرد چیرۆکی خۆم بگێڕمەوە. دەتوانم بڵێم ئەو ساڵە دەرفەتێکی زۆر باش بوو تا ئێمە ئەنفال بە کۆمەڵگەی ئەمریکی بناسێنین.

- **لە قسەکانی پێشووترتدا دوو پرسیارم لا دروست بوو، بۆ ئەوەی لە رووداوەکان دانەبڕم، ئەوکاتە پرسیارەکانم نەکرد، ئێستا دەمەوێ لێت بپرسم ووتت کاک فازڵم لە ئەمریکا بینییەوە و دوو کچیانم راکیشا بۆ ئەمریکا. دەمەوێ ئەوەم بۆ باس بکەیت، چۆن بوو.؟**

- ئەوکاتەی لە (گوام) بووین لە ئەمریکا هێشتا ماوەیەکی کەم بوو، برابووینە ئەوێ و وەك باس دەکرا دەبوو چەند ساڵێك لێرە بمان هێڵنەوە، لەگەڵ یەك دوو برادەر پێکەوە شەوێك دەچووین بۆ سینەما هەندێ کەس پەلاماریاندام، لە راستیا ئێمە نەمانزانی چی بوون و بۆچی وایانکرد، بەڵام بەهۆی ئەوەی من تاکە رزگاربووی ناو ژن و منالە ئەنفالکراوەکان بووم و لەلایەکی تریشەوە بەهۆی ئەوەی ماوەی چەند ساڵێك لەماڵی مام جەلال ژیابووم و وەك کوڕی ئەوان

سەیر دەکرام، لە راستیا نەمانزانی بەهۆی کامیانەوە بوو ئەوەمان بەرانبەر کرا، باش بوو ئەمنیەتی ئەو شوێنە گەیشتن پێم و بردمیانە ژورێك دایاننام، کۆمەڵێك کوردی دۆست و برادەر ئەوەیان زانی بوو هەر لەوێ کۆبوونەو وەك بلێی جۆرێك لە خۆپیشاندانیان سازکرد بۆ پشتگیری لە من، خەریك بوو ببێتە کێشەیەکی گەورە، ئەو جەماعەتەی هاتبوون تەحقیقیان لێم کرد ئەم رووداوە بەهۆی چییەوە بووە، کە منیش قسەم بۆ کردن و خۆم پێناساندن، لە ئەمریکا وابوو هەموو دەزگاکانی رەبتیان پێکەوە هەبوو هەر لە کۆمپیوتەرەکەی خۆیەوە هەموو شتێکی دەربارەی تۆ دەزانی، ئیتر زانیان من کێم و چیرۆکی من لای ئەوان روون بوو، ئەوان پێمیان ووت کە ماڵێکی عەرەب لێرەن لە ئەمریکا ئەوان تۆیان رزگار کردووە لە سەماوە. پرسیارم زۆرکرد دەربارەیان کامیانە و لەکوێ دەژێ و ناونیشانیان یان ژمارە تەلەفونێکم دەست کەوێت، بەلام هیچیان پێنەدام و هەر ئەوەنەیان ووت لەو بارەیەوە. بۆ من هەواڵێکی تا رادەیەك خۆش و ناخۆشیش بوو. خۆش بوو کە لێرە و دوای ئەو هەموو ساڵە ئەو خێزانە ببینم کە هەموو ژیانی خۆیان لە پێناوی منا خستە مەترسیەوە و ناخۆشیش بوو کە ئەگەر نەیان دۆزمەوە، چونکە ئێستا دوای ئەم هەواڵە هەموو یادگاریەکی ژیانم بووەوە بە بەشێك لە سەماوە و ئالعێشم و رووداو و یادگاریەکانی ئەوێ هەمووی وەکوو فلیمێکی تەلەفزیۆنی بە بەرچاوما دێن و دەچن، بەلام ئەگەر

نەیاندۆزمەوە زۆر ناخۆشە و ئازاری پێدەچێژم. ئەو تیمە کە وابزانم سەر بە (FBI) بوون بڕیاریاندا لە (گوامەوە بمگوێزنەوە بۆ ڤێرجینیا). پێم وتن کە هەر من نیم و چەند کەسێکی تریش هەن وەك من وان و لێرە پێکەوەین، وتیان دەزانین و ئەوانیش دەنێرین بۆ (ڤێرجینیا). لەلایەك بۆ ئەوەی لە مەترسی دووریم حەزم دەکرد بچمە شوێنێکی تر و لەلایەکیش دەمویست هەر لێرە بمێنمەوە ئەویش بەهۆی ئەوەی هەواڵی ئەوەم زانی ماڵی یەکێ لە عەرەبەکانی سەماوە کە منیان رزگارکردووە لە ئەمریکان، باوەڕم وابوو کە رەنگە ئەویش هەر لە (گوام) بێت، ئەمووت مادام ئەمان دەزانن ئەو ماڵەیە منی رزگار کردووە ئەوە رەنگە هەر وەك ئێمە ئەمریکا خۆی هێنابێتی بۆ ئێرە و حەزم دەکرد ئەوان بدۆزمەوە، بەڵام ئەمریکا بەقەدەر نیووەی دنیا دەبێت ئەگەر زانیاری تەواوت لەسەر ناونیشانیان دەستنەکەوێت بەچی دەدۆزرێنەوە.

منیان نارد بۆ ڤێرجینیا، بێ ئەوەی هیچ دەربارەی ئەوە بزانم لەوێ دەچمە کوێ، بەڵام دیار بوو خۆیان چارەسەریان بۆ دۆزیبوومەوە، رۆژی 1997/2/27 لە گوامەوە رۆیشتم لە فڕۆکەخانەی (رۆناڵد رێگان) دابەزیم، کەسێك هات بە پیریمەوە و وتی جەنابت کاك تەیموریت.؟ پێم ووت بەڵێ، هەواڵ پرسین و چاك و چۆنی لەگەڵم کرد و ووتی من دکتۆر بەرهەمم وەرە لەگەڵم، من تا ئەو کاتە دکتۆر بەرهەمم نەدەناسی بەڵام بەناو بیستبووم و دەمزانی نوێنەری

حکومەت و یەکێتیە لە ئەمریکا، بردمی بۆماڵی خۆیان و وابزانم حەوت مانگ لەماڵی ئەوان بووم.

هەر دوای من نازانم چەندی پێچوو کاك عەزیز و ئەوانیشیان گواستەوە بۆ ڤێرجینیا. دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر بوو لە ماڵ دکتۆر بەرهەم بووم، خۆی و سەرباخ خانی خێزانی هاوکارێکی باشم بوون تا تەواو بەم شوێنەی ئێستاش راهاتم و ئیتر من و کاك عەزیز و کاك نوری برای و دایکی پێکەوە خانوویەکمان گرت و پێکەوە دەژیاین. رۆژێك دکتۆر بەرهەم تەلەفونی بۆ کردم ووتی تەیمور عەرەبێك تەلەفونی بۆ کردووم ئەڵێت من کوڕی ئەو ماڵەم تەیمورمان رزگار کردووە، داوای ژمارەی تەلەفونەکەتی کردووە ویستومە پرس بەخۆت بکەم بیدەمێ.؟ منیش زۆرم پێخۆش بوو بەدرێژایی ئەو ماوەیەی ئەو هەواڵەم زانی بوو هەر لە خەمی ئەوەدا بووم چۆن شوێنی بزانم، ئیتر کاك بەرهەم ژمارەکەمی دابووپێی و تەلەفونێکم بۆ کرا کاك (فازڵ گتێڵ عێشم) بوو ئەو سەربازەی کە ووتم لە کەلار هات بۆ لام و منی بردەوە بۆ سەماوە بۆ لای کەسوکارەکەی وە برای کاك (ساڵەح) بوو کە لەرێی سەربازە کوردەکەوە کەسوکارمی دۆزییەوە و برای (جاهل) بوو ئەو سەربازەی یەکەم شەو لە سەماوە بینیم و لە ترسا خۆم کردەژێر مێزەکەوە، برازای فالح سەفاح بوون ئەو ماڵەی بە زۆری من لەوێ دەمامەوە لە سەماوە و هەردوکیان زاواشی بوون. بە تەلەفۆن هەندێ قسەمان کرد دیار بوو ئەویش وەك

من خۆشحاڵ بوو کە یەکتریمان دۆزییەوە، ناونیشانم لێی وەرگرت ئەو لە (میشیگن) بوو، بلیتی تەیارەم بڕی و چووم بۆ ماڵیان. کاك فازڵ خۆی و 4 منالی و ژنەکەی و برایەکی لەوێ بوون کە لە سەماوە هەموویانم دەناسی. بەو جۆرە یەکتریمان بینییەوە و ماوەیەك لایان مامەوە.

- **ئەومت نەپرسی چۆن ئەوان گەیشتبوونە ئەمریکا.؟**

- بەڵێ پرسیارم کردن ئەوان پێش هەر شت سوپاسی منیان دەکرد کە لەهیچ مقابەلەیەك ناوی کەسیانم نەبردووە و ئەیانووت ئەگەر یەکجار ناوی یەك کەسمانت بهێنایا ئەوە حکومەت هەمووومانی دەکوشت، لە ساڵی 1991 دوای ئەوەی خۆپیشاندانی شارەکانی عیراق شکستی هێنابوو کە سەدام پەلاماری دابوونەوە، ئەمان چووبوونە حدودی سعودیە، دیارە لەوێش وەك لای خۆمان نەتەوەیەکگرتووەکان و ئەمریکیەکان کەمپ و شتیان هەبووە، گوایا لە رادیۆیەك گوێیان لە بەسەرهاتی من بووە کە باسی کردووە منالێکی کورد لە ئەنفال رزگاری بووە و ماڵێکی عەرەب لە سەماوە گرتویانەتە خۆیان و پاراستویانە تا بە کەسوکاریان گەیاندۆتەوە، چووبوونە لای ئەمریکیەکان و وتبوویان ئەو ماڵە عەرەبە ئێمەین، زانیاریەکانیان لەوانیش وەرگرتبوو هەمان چیرۆك بووە کە من باسم کردبوو ئیتر برابوون بۆ ئەمریکا.

- **ئەوەی باسکرد کە دوو کچیانت راکێشا بۆ ئەمریکا، ئەوەت چۆن کرد.؟**

– ئەمووت بەهۆی ماڵی کاك فازڵەوە، لەوێ زانیم دوو کچیان (حەکیمە و کەریمە) لە عێراق رایان کردبوو چووبونە سوریاو ماوەیەك لەوێ سجن بوو بوون، کاك فازڵ خۆی چەند جارێك چووبووە سوریا و وەك باسی دەکرد پارەیەکی زۆر زۆریان سەرف کردووە تا لە سوریا رزگاریان کردوون و بردویانێتیێ ئەردەن و لەوێوە نەیتوانیووە بیانهێنێ بۆ ئەمریکا و ئێستا ترسی ئەوەیان هەیە بیانگێڕنەوە و تەسلیم بە عێراقیان بکەنەوە. بۆ من حاڵەتێکی زۆر ناخۆش بوو، ئەوان ژیانی خۆیان و ماڵ و مناڵ و هەموو کەسوکاریان خستبووە مەترسیەوە لەبەر پاراستنی من، ئێستا من چۆن بتوانم هاوکاریان بکەم ئەو دوو کچەیان لە مەترسی رزگاریان بێت. نەمدەمزانی چۆن وابکەم کورد خۆی بکاتە خاوەنیان و لە رێگەی عیلاقاتەکانی کوردەوە رزگاریان بکەین، بەڵام ئەمووت ئێستا من بەو جۆرە خەفەتیان لێدەخۆم کێ دەڵێت کورد دەربەستی ئەوان دێت، یان ئەگەر بەهەر کەسێك بڵێم کێ دەڵێت باوەڕم پێدەکەن کە ئەو دوو کچە پەیوەندیان بە چیرۆکی رزگار کردنی منەوە هەیە، زۆر ناخۆش و ئیحراج بوو بۆ من. پاش ماوەیەك ئەوە بە بیرما هات بۆچی بە ئەو رێکخراوە نەڵێم کە خۆمیان هێنا بۆ ئەمریکا، ئەوان بەردەوام پەیوەندیان لەگەڵمان هەبوو، تەلەفونم کرد بۆ رێکخراوەکە و لەگەڵ

(پۆست هێڵتەرمان) قسەم کرد. سەرەتا ئەو ووتی کە ناتوانین هاوکاریان بکەین بەهیچ جۆرێك. پێم ووت ئەی بۆ توانیتان من بگەیەننە ئێرە. (پۆست هێڵتەرمان) وتی کەیسی تۆ جیاوازە، تۆ شایەتی لەسەر بەکۆمەڵکوشتنی هەزاران کەس لە ئەنفال، پێم ووت بەلام من منداڵ بووم و ئەو شوێنانە نازانم کە خەڵکەکەی تیا کوژراوە، ئەمان خۆیان خەڵکی ئەوێن و شایەتی رزگارکردنی من و شوێنی گۆڕەبەکۆمەڵەکانیشن، قسەکانمی پێخۆش بوو پێمی ووت چەند رۆژێکی تر وەلامت لێدەگێڕمەوە.

خۆشبەختانە کەمتر لە هەفتەیەکی پێچوو (پۆست) وەلامی دامەوە کە ناو و ناونیشانیانی پێبدەم. منیش پەیوەندیم بە کاك فازڵەوە کرد و ئەو شتانەم وەرگرت کە (پۆست هێڵتەرمان) داوای کرد. دوای هەفتەیەك جارێکیتر (پۆست) تەلەفونی بۆ کردم ووتی رەزامەندیم وەرگرتووە خۆم بچم بۆ ئەردەن بۆ لایان، پێیان بڵێن خەمیان نەبێت و نەترسن لەوەی بیانگێڕنەوە بۆ عیراق، ئەوە بە رەسمی داوامان لە حکومەتی ئەردەن کردووە ئەو دوو هاولاتیە نابێ بنێرنەوە بۆ عیراق. (پۆست) چووە ئەردەن و مقابەلەی کردبوون دوای شەش مانگ رەزامەندی لەسەر ئەوە درا بهێنرێن بۆ ئەمریکا و ئەو رۆژەی گەیشتن منیش چووم بۆ پێشوازیان و ماوەی 5 مانگیش لەگەڵیان مامەوە لە ماڵی کاك فازڵ.

- **کەی توانیت بۆ یەکەمجار بگەڕێیتەوە بۆ کوردستان.؟**

– پێش روخانی سەدام ئەوان (میدڵ ئێست وۆچ) کە بەرپرس بوون لە کەیسەکەی ئێمە ئامۆژگاریان کردبووین کە بە هیچ شێوەیەك نابێت بگەڕێنەوە بۆ عیراق. بەڵام کە ئەمریکا هاتە عیراق و سەدام روخا، ئیتر دەمانتوانی بێینەوە یەکەمجار کاك فەرەج و کاك عەزیز و ئەوان سەریاندایەوە لە کوردستان، بەڵام هەر دەبوو ئاگاداری خۆیان بن. من نەهاتمەوە تا ساڵی 2005.

- **ئەی تۆ چۆن نەگەڕایتەوە.؟**

– لە راستیا هەر ئەو رۆژەی سەدام روخا زۆرم حەز دەکرد بێمەوە و بە ئازادی بچمەوە بۆ بیابانەکانی سەماوە سەردانی گۆڕەبەکۆمەڵەکان بکەم، بچمەوە سەر خۆڵی قەبرەکەی دایکم و خوشك و پورم و خزم و کەسوکارەکەم. بچمەوە بۆ سەردانی ئەو ماڵانەی سەماوە و ئالعێشم و سوپاسیان بکەم کە رزگاریان کردم، دەمویست ئیتر هەموو دونیا بزانێت ئەم ماڵە بوون منیان رزگار کرد، دەمویست بێمەوە گۆڕەبەکۆمەڵەکان هەڵدەینەوە تا هەموو جیهان بەچاوی خۆیان ببینن، دەمویست بێمەوە و حکومەتی کوردستان ئەو ماڵە بناسێت و کورد پاداشتیان بداتەوە کە ژیانی بنەماڵەیەکیان لەبەر مناڵێکی کورد خستبووە مەترسیەوە. دەمویست بێمەوە و بە حکومەتی کوردی بڵێم با بچین رووفاتی ئەنفالەکان بێنینەوە. بەڵام

راستیەکەی ئیمکانیاتی ئەوەم نەبوو بلیتی تەیارە بکڕم و بتوانم بێمەوە بۆ کوردستان. کاتێ ئەم قسەیە دەکەم رەنگە خەڵك پێی سەیربێت، لە کاتێکدا ئەگەر خێزانێکی کورد کەسێکیان لە ئەورووپا بوایا لێرە چەند خێزانێکی دەژیاند، بۆچی دەبێت من ئیمکانیاتی ئەوەم نەبووبێت تەنها بۆ سەردان بگەڕێمەوە وڵاتەکەی خۆم، بەڵام ئەمریکا سیستەم و شێوەی ئیدارەکردنیان جیاواز بوو لە ئەورووپا. سۆسیال لە ئەمریکا نیە، بۆ کەسێك ئەگەر خێزاندار بوایا باشتر بوو بەڵام بۆ گەنج خانووت ناداتێ، مەسرەفت ناکات. ژیان لەوێ زۆر زەحمەت بوو، تەنانەت کاریشم دەست نەدەکەوت. کێشەی ئەوەمان هەبوو کارمان بدرێتێ، کێشەی زمانمان هەبوو، کێشەی شەهادەمان هەبوو، کێشەی هاتووچۆمان هەبوو. ئەمە نەك بە تەنها بۆ من بۆ کاك فەرەج کە لە هەموومان گەورەتر بوو، بۆ کاك واحید و کاك عەزیز و کاك رەمەزانیش وابوو. بیرمە تازە چووبوومە (ڤێرجینیا) ئەوکاتەی هێشتا لەماڵی دکتۆر بەرهەم بووم بە هەردوکمان بەدوای ئیشدا دەگەڕاین بۆ من، ئەوەبوو لە رێگەی برادەرێکی خۆیەوە ئیشێکیان بۆم دۆزییەوە چووم چەند رۆژێکی کەم ئیشم کرد دوایی وازم لەو کارە هێنا نەمئەتوانی چونکە بۆ من زۆر قورس بوو بەهۆی شوێنی گوولەکانی سەرپشتم و شانمەوە نەمئەتوانی کارێکی وا قورس بکەم، ئیشەکە کۆکردنەوەو هەڵچنینی تایەی کۆنە بوو، تایەی

وای تیابوو لەکێشی دوو زەلاما نەبوو دەبوو من بتوانم رۆژانە هەڵیانبچنم. بۆیە وازم لەو کارە هێنا.

ماوەیەك دوای ئەوە لە غەسلێك کارم دەستکەوت رۆژانە دەبوو سەیارە بشۆم، بەلاّم گەورەترین کێشەم هاتووچۆ بوو سەیارەم نەبوو، شوێنی کارەکە و شوێنی مانەوەم زۆر دوور بوو، ناچار بووم دەچوومە ئەوشوێنەی پاسکیلی شکاویان لێی فرێدەدا تا پاسکیلێك بدۆزمەوە کە فرێ درابێت و من بتوانم بەکاری بێنم، پاسکیلێکی شکاوم چاك کردەوەو رۆژانە بەو پاسکیلە دەچووم بۆ سەر کار و دەهاتمەوە. رۆژانە لەناو ئاو کارم دەکرد و تا دەچووم و دەگەڕامەوە هەر باران لێمی ئەدا، حاڵم زۆر خراپ بوو. لە ناچاریا ئەو کارەم گۆڕی چەند ئیشێکی ترم دەکرد ماوەیەك کاری (ماکدۆناڵدم کرت، لە متبەخی چێشتخانە کارم کرت، لە پیتزاهات، بۆیاخچی، شوشەی سەیارەم دەگۆڕی) جا چی کارێك ماوە لە ئەمریکا من ناچار نەبم بیکەم. بۆ کەسێکی وەك من دەبوو شەو و رۆژ بخەمە سەریەك کاربکەم تەنها بۆ ئەوەی بتوانم لەوێ بژێم، بڕوابکە دەیان شەو لەبەر نەبوونی جێگە لەناو سەیارە خەوتووم، بۆیە نەمئەتوانی بەشی ئەوە پاشەکەوت بکەم کە بتوانم سەفەری پێبکەم و بێمەوە. لە بیرتە جارێکی خۆت تەلەفۆنت کرد بێینەوە بۆ بەشداری لە کۆنگرەی ئەنفال لە هەولێر، بڕوا بکە ئەوە یەکەمجارە دەیڵێم لەبەر ئەوەی

ئیمکانیەتی بلیت کڕینمان نەبوو بۆیە کەسمان نەهاتینەوە بۆ کۆنگرەکە.

- **ئەی لە 2005 چۆن هاتیتەوە، بانگهێشتکرایتەوە لە لایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە.؟**

– نەخێر بانگهێشتی چی، ماوەیەکی زۆر بوو بەردەوام کارم دەکرد و پارەم پاشەکەوت دەکرد تا بتوانم ئەگەر بۆ یەکجاریش بووە بگەڕێمەوە، لەساڵی 2005 توانیم بۆ ماوەی سێ مانگ بێمەوە، زیاتر بەهیوای ئەوەوە گەڕامەوە کوردستان کە دەرفەت هەبێت بتوانم بچمەوە بۆ سەردانی سەماوە و گۆڕەبەکۆمەڵەکان.

- **توانیت ئەو سەردانە بکەیت.؟**

– ئەو جارە نەخێر، چونکە کاتێ من گەڕامەوە دادگای باڵای تاوانەکانی عیراق دروست کرابوو، ئێمە بەڕەسمی ئاگادار کرابووین کە دەبێت ئاگاداری خۆمان بین و بمێنین بۆ دادگا چونکە وەك شایەت دانرابووین. لەبەر ئەوە خۆم نەمتوانی بچم دەترسام لەوەی توشی گرفت بێم، بەتایبەتیش ئەو کاتانە وەزعی ئەمنی عیراق تێکچوو بوو، بە کورتی و بە کوردیەکەی ئاواتم ئەوە بوو کە بچم بۆ بیابانەکانی سەماوە، وا هەستم دەکرد کە لە هەرێمی کوردستان هەموو کارئاسانیەك دەکرێت و لایەنی ئەمنی دابین دەکەن و

حکومەت خۆیان مەبەستیانە گۆڕەبەکۆمەڵەکان بدۆزنەوە، بەڵام هیچ هەڵوێستێکم نەبینی کە هەست بکەم ئامادەی هاوکاری کردنمن. هیچ موبادەرەیەکم نەبینی. کە گەڕاشمەوە ئەوکات کوردستان وەك ئێستا نەبوو مەتار نەبوو، هاتمە سوریا و بە سەیارە گەڕامەوە سلێمانی و لەڕێوە چوومە سەیدسادق بۆ ماڵی (خاڵم عەلی) کە ئەو هەر لە کۆڕەوەکەی ساڵی 1991 لە سەیدسادق نیشتەجێبوون و نەگەڕایەوە بۆ گەرمیان. چەند رۆژێك لای ئەوان بووم دواتر چوومەوە بۆ گەرمیان بۆ ماڵی مامەکانم و خزمان. بە زۆری ئیتر ئەو سێ مانگە هەر لەم ناوە بووم تا گەڕامەوە بۆ ئەمریکا.

- **لەگەڵ دەستپێکردنی دادگاییکرنی سەدامدا هێنرانەوە بۆ عیراق بۆ بەشداریکردن لە دادگاییکردنی سەدام.؟**

– نەخێر، ئێمە بۆ کاتی دادگایی کەیسی ئەنفال هێنراینەوە، ئەو رۆژەی چوومە هۆڵی دادگا و شایەتیمدا رۆژی 2006/11/27 بوو.

- **پێش ئەوەی بێنەوە بۆ بەغدا ئەوکاتەی هێشتا لە ئەمریکا بوون، هیچ تیمێك لە دادگای باڵای تاوانەکانی عیراقەوە هاتن بۆ لاتان، بۆ نمونە ئیفادەتان وەرگرن، یان مقابەلەیەکتان بکەن.؟**

– بۆلای من نەهاتن، بەڵام وابزانم هاتبوون مقابەلەی ئەو برادەرانەی تریان کردبوو، چونکە رووداو و شایەتیەکەی من تا رادەیەك ناسراوتر

بوو لەوان، چەند جارێك (FBI)  و لێکۆڵەرەوەی ئەمریکی خۆیان مقابەلەیان کردبووم.

- **هیچ تیمێکی ئەمریکی لەگەڵتان هاتن و دوای تەواو بوونی ئەرکەکەتان لەگەڵتان بگەڕێنەوە بۆ ئەمریکا.؟**

– بەڵێ من لەژێر چاودێریەکی ووردی ئەمنیدا بوونم، هەرچەندە پێکەوە نەگەڕاینەوە بەلاَم وابزانم برادەرانی تریشم بەو جۆرە بوون، چونکە تەنها ئێمە شایەتی بە کۆمەڵکوشتنی ئەنفالەکان بووین، خەڵك زۆر بوو وەك شکاتکار و وەك شایەت، بەلاَم ئەوان تەنها شایەتی ئەوە بوون کە هاولاَتیەکی زۆری کورد بێسەروشوێن کراوە، زانیاری گوولەبارانکردن و بەکۆمەڵکوشتنیان لای ئێمە بوو. بۆیە پێشتریش چەند ساڵ بوو برابووینە ئەمریکا و لە رووخانی سەدامیشەوە تا کاتی دادگاییەکە زۆر بەلایانەوە گرنگ بوو کە ئێمە پارێزراو بووین. کاتێ گەیشتینە بەغداش تیمی تایبەتی ئەمریکی پاسەوانیان دەکردین و لە رۆژانی ئامادەبوونیشماندا لە دادگا هەر لەژێر چاودێری و پارێزگاریەکی توندوتۆڵدا بووین.

- **ئێستا هەستت چۆن بوو کە مام جەلال لە 1992 و دکتۆر بەرهەم لە 1997 پێیان دەوتیت رۆژێك دێت سەدام دادگایی دەکرێت و تۆ دەبیتە شایەت لەسەری.؟**

- وەڵا وابزانم پێشتریش ئەم پرسیارەت لێمکرد، ئەوکاتەی ئەوان وایان دەووت هەر گاڵتەم پێدەهات و هیچ کات باوەڕم وانەبووە ڕۆژێك بێت عیراق بڕوخێت و سەدام بخرێتە قەفەسی تاوانەوە. بەڵام کە ئێستا ئەوە ڕوویدا بۆ ئێمە زۆر خۆش بوو، حاڵەتێك بوو قەت دووبارە نابێتەوە، ناتوانرێت چێژو خۆشی بەدیهاتنی ئاواتێکی ئاوا گەورە بە باس کردن دەربڕیت.

- **پێتخۆش بوو دادگا چی بڕیارێك بدات لەسەر تاوانی ئەنفال.؟**

- وەڵا بەحەزی من بوایا دەمویست سەدام بەدەستی خۆم پارچە پارچە بکەم، حەزم دەکرد دادگا حوکمی هەموو ئەوانەی بدایا کە هەر لە ملەسورەوە ئێمەیان برد بۆ قۆرەتوو، ئەوانەی لە قۆرەتووەوە ئێمەیان برد بۆ تۆپزاوا و هەموو ئەوانەی بردیانین بۆ بیابانەکان و گوولەبارانیان کردین. بەڵام هەموو ئەوانەی لەسەر ئەنفال دادگایی دەکران بەقەدەر ژمارەی حەرەسەکانی یەك قاعەی تۆپزاوا نەبوون. ئەی کوا ئەو هەموو ئامر لیوا و قوات خاسانەی ئێمەیان بەو دەردە برد، کوا ئەو هەموو سەرۆك جاشانەی فێڵیان لە خەڵك کرد و دەیانووت حکومەت عافواتی داوە و دەتانبەن بۆ موجەمەع. کوا ئەو زاڵمانەی لە تۆپزاوا بینیانم کە ڕەحمی خوا لە دڵیانا نەبوو پیرێژن و پیرەمێردەکانیان ئەدایە بەرشەق. من پێمخۆش بوو هەموو ئەوانە بدرایەتە دادگا، وە حوکمێکی عادیلانەی

هەموویان بدرایا. ئەوەی ئێمە لە هۆڵی دادگا بینیمان شەش حەوت کەس بوون، ئیعدامکردنی هەموویان خوێنی ئەو کچە بچووکە نەبوو کە لە گۆڕەبەکۆمەڵەکانی بیابانی سەماوە بە زیندوێتی کرایەژێر خۆڵەوە.

- **یەکەمجار کە چوویتە هۆڵی دادگاوە هەستت بەچی دەکرد، کە سەدام و ژمارەیەک لە بڕیاربەدەستانی بەعس لەناو قەفەسی تاواندان و تۆش لە بەرانبەریان راوەستاویت شایەتی لەسەر تاوانەکانیان دەدەیت.؟**

– من ئەڵێم رەنگە ئیحساسی وەرگرتنەوەی ماف بۆ منالێك جیاواز بێت لە کەسێکی گەورە، لەبەر ئەوەی من منالێکی 12 سالان بووم کە ئەنفال کراین و ئەو هەموو تاوان و زوڵم و کوشتوبڕە بە بەرچاومەوە ئەنجامدران، حالەتێکی نەفسی لام دروستکردبوو کە ئەگەر کەسێکی بە تەمەن گەورە تربووایام و ئەو تاوانانەم ببینیایا حالەتەکەی جیاواز تر دەبوو. تۆ بیهێنەرە پێشچاوی خۆت منالێکی بچوك لە قوتابخانە قەڵەم یان قەڵەمتاشێکی منالێکی لەخۆی گەورەتر لێی زەوت دەکات و نایداتەوە، کاتێ مامۆستا یان منالێکی لەو بەهێزتر ئەو قەڵەم و قەڵەمتاشە وەردەگرێتەوە و دەیداتەوە بە منالە بچووکەکە، چی هەستێکی خۆشی هەیە. ئەی بیهێننە پێشچاوی خۆتان من منالێکی بەدبەختی گوندێکی گەرمیان بووم، لە ژیانی

ئاسایی لادێوە دەستگیربکرێم و باوك و مام و خاڵ و نەنکت بە بەرچاوتەوە جیابکرێنەوە و عەسکەر بکاتە پەلیاندا و کەس نەزانێت بۆ کوێیان دەبەن، خۆشت تینوو برسی بکرێیت لە زیندان و پاشان ببرێتە چۆڵەوانیەك تەنها خوا لە ئاسمانەوە دیاربێت بە بەرچاوتەوە دایکت و خوشکت و دەیان ژن و مناڵ بدرێنە بەر گوولەی کلاشینکۆف، خۆشت لە شەوێکی تاریك و بەتەنها بیابان بدەیتەبەر، بکەویتە دەستی ماڵێك نە زمانیان بزانی و نە لێت تێبگەن، ماوەی دوو ساڵ دوای ئەو کارەساتە دوور لە کەسوکار و میللەتەکەی خۆت و هەموو سەعاتێکی ژیانت پڕبێت لە ترس، ئێستا ببینم ئەوانەی لە بەغدا حوکمیان دەکرد و لەم بەغدایەوە بڕیاری بەکۆمەڵکوشتنی کەسوکارمانیاندا، ئەمانە بوون بە کۆپتەر رەمیان لێمان دەکرد و دەترساین کیمیایی بکەنە سەرماندا، ئێستا ئەوان هەر لەناو بەغدا خراونەتە ناو قەفەسی تاوانەوە و من ئەو مناڵە بەدبەختەی کورد کە شوێنێك نەبوو لەم وڵاتە بۆ من جێی ترس نەبێت، هاتووم و بەرانبەریان راوەستاووم تاوانەکانیان دەخەمەڕوو، کۆمەڵێك دادوەر دانیشتوون و گوێ لە شایەتی من دەگرن و سەدام و ئەوانیش گیانیان دەلەرزێ لەوەی بەهۆی قسەکانی منەوە ئیعدام بکرێن. هەستێك بوو مەگەر هەر خوا خۆی بتوانێ تەعبیری لێبکات، چۆن بە باسکردنی بەهەشت و جهەنم کەس ناتوانێ ئەوەی هەیە وەك خۆی

بیخاتەڕوو، بۆ منیش هەستێکی ئاوها بوو، ناتوانم دەربیبڕم چی هەستێکی خۆش بوو.

- **هەست ئەکەی ئەو دادگاییکردنە چی لەژیانت گۆڕی.؟**

– ئەتوانم بڵێم بیروباوەڕمی گۆڕی، کە ئەو دیمەنەم بینی گەیشتمە باوەڕێك هیچ تاوانێك تا سەر نابێت. دەڵێن خوا ڕۆژی قیامەتی داناوە بۆ هەق و حسابی زاڵم و مەزڵوم، بەڵام من باوەڕم وایە نەخێر خوا لەسەر زەوی تۆڵە لە زاڵمەکان دەکاتەوە.

- **یەکەم چرکەساتی ڕووبەڕوو بوونەوەت لەگەڵ سەدام، هیچ ترسێکت نەبوو، هیچ نەیێت لەو ڕابردووەی بینیبووت کە ئەو وڵاتە تۆقێنەرە هەمووی لە مێشك و عەقڵی ئەم کابرایەوە بوو.؟**

– نەخێر ناترسام، بەڵکوو موچڕکی خۆشی سەراپای لەشی داگرتبووم. هەرچەندە ئەو کاتەی سوێندەکەم خوارد کە هەرچی ڕاستە ئەوە دەڵێمن سەدام بە ئیشارەت هەڕەشەی لێکردم، بەڵام نەترسام و سەربەرزانە و لەپێشچاوی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن کە دونیا تەماشای دەکرد، شایەتی خۆم دا.

- **سەدام چۆن هەڕەشەی لێکردیت، قسەی کرد.؟**

– نا، ئەوکاتەی دەستم خستە سەر قورئانەکە و سوێند بخۆم ئەوانیش هەستابونە پێوە، بە دەستی کە بەسەر ڕیشەکەیدا دەیهێنا پەنجەی

شایەتمانی لەژێر چەناگەیەوە بەسەر ملی خۆیدا هێنا وەك ئاماژەیەك کە سەرت دەبڕن. چونکە لە کاتی دادگاییەکە پڕوپاگەندە زۆر دەکرا کە هەر کەس شایەتی لەسەر بدات دوای بەعسیەکان تیرۆری دەکەن. دەیانووت یەکەم ڕۆژی دەستپێکردنی دادگاییەکە بەعسیەکان خۆیان ئامادە کردووە بۆ تەقینەوە بەڵام لەبەر ئەوەی نەیانزانیووە سەدام لەکوێ دادگایی دەکرێت نەیانتوانیووە هیچ بکەن، بەڵام کە دادگاییەکە دەستپێکردووە و ئەوکاتەی سەدام قسەی کردووە ناوی ئەو شوێنەی هێناوە کە هۆڵی دادگاییکردنەکەی لێدروستکراوە، ئیتر گوایە دراوەتە بەر کاتیۆشا. ئەم جۆرە قسانە لە هەندێ ئیعلام و لەناو خەڵکیشدا دەکرا تا ئەوانەی شکاتکارن و ئەوانەی شایەتی تاوانەکانی سەدامن بترسن، من پێشتر ئەو قسانەم بیستبوو، بۆیە ئاماژەکەی سەدامیش بە هەڕەشەی ئەوە تێگەیشتم کە مەبەستی ئەوەیە دوای دەستوپێوەندەکەی سەرم دەبڕن، دەیویست بەو جۆرە بمترسێنێ، بەڵام کە قسەمکرد هەستم کرد ئەوان لەمن دەترسن نەك من لەوان.

- **دەتوانی پوختەیەکی دانیشتنەکەی دادگام بۆ باس بکەیت.؟**

- بەڵێ، سەرەتا بەڕێز دادوەر داوایکرد سوێند بخۆم، ئەو داوایکرد بەدوایدا سوێندەکە بڵێمەوە، قورئانێك دانرابوو دەستم خستەسەری و ئەم سوێندەم خوارد (سوێند ئەخۆم بەخوای گەورە کە هەموو

راستیەکان بڵێم وە لە راستی زیاتر هیچ نەڵێم). ئەوکاتەی من دەستم خستبووە سەر قورئانەکە هەموویان هەستابوونە پێوە، تەنانەت سەدام و عەلی حەسەن مەجید و تاوانبارەکانی تریش. ئیتر دادوەر داوای لێمکرد قسەکانم بکەم، منیش ئەوەی روویدابوو لە گوندەکەی خۆمانەوە و چوونمان بۆ تیلەکۆ و بۆ ملەسورە و چۆنێتی بردنمان بۆ قۆرەتوو، دوای هێشتنەوەمان بۆ ماوەی دە رۆژ دوای ئەوە بە سەیارەی مەدەنی (لۆری) بردمانیان بۆ تۆپزاوا. لەوێ تەفتیشکراین و خێزانەکانیان لەیەك جیاکردەوە، ماوەی سێ رۆژیش لە تۆپزاوا بووین بەیانیانێك کۆمەڵێك سەیارەی موقەپەتیان هێناو ئێمەیان بە زۆر سوارکرد. سەیارەکان (موقەپەت بوون) سەرداپۆشراوبوون، دیاربوو حاکمەکە لێم تێ نەدەگەیشت موقەپەت چیە لێمی پرسی چۆن موقەپەت بوون، منیش بۆم باسکرد کە پەنجەرەی نەبوو شوێنی هەوا نەبوو دوو منداڵ لەبەر نەمانی ئۆکسجین لەناو سەیارەکە مردن، باسی باجی پیرۆزم کرد و داوام لە حاکم کرد کە قایمەیەکم پێ یە ناوی زۆربەی ئەوانەی تیایە کە لەگەڵ خۆم بوون و گوولەبارانکران. باسی ناو سەیارەکە و تینوێتی و تەنگەنەفەسی خۆمانم کرد، باسی ئەوەی کە گەیشتینە شوێنێك وەك سەربازگە وابوو سایەقەکان دابەزین، لەوێ حاکم زۆر پرسیاری لێم کرد لەسەر شێوەی مەعەسکەرەکە و لەناوەوە چی تیابووە ئایا سجنی لێبوو، پێم ووت ئێمە نازانین چونکە ئێمە هەر لەناو سەیارەکان بووین. کە

باسی ئەوەمکرد سەیارەکان ماوەیەکی تر ڕۆیشتن و چووە سەر ڕێگایەکی خۆڵ، حاکم لێمی پرسی بەچی دەتزانی کە ڕێگای خۆڵە تۆ ناڵێی سەیارەکان پەنجەرەی نەبوو. بۆم ڕوونکردەوە کە لەناو سەیارەکە بەهەستکردن دەمانزانی کە جادەی قیرە یان ڕێگای خۆڵ. ئیتر لە باسکردنی چۆنێتی گولەبارانکردنمان و بەکۆمەڵکوشتنەکە حاکمەکەش زۆر پرسیاری دەکرد لەسەر چۆنێتی وەستانی جوندیەکان و جۆری چەکەکانیان، قوڵی و پانی چاڵەکە، ژمارەی ئەو کەسانەی لەگەڵم بوون، ناوی مناڵەکانی ماڵ خۆڵۆم چی بوو، بە کورتی ڕووداوەکانم باسکرد. جار جار دادوەر پرسیاری لێم دەکرد، لە کاتی باسکردنی گوندەکە و گواستنەوەم بۆ شارەکە، حاکم پرسیاری کرد چی گوندێك و چی شارێك بوو، پێم ووت ناتوانم ناوەکانیان بڵێم لەبەر حاڵەتی ئەمنی دوای پێشکەش دادگای دەکەم، چونکە دانیشتنەکەی دادگا ڕاستەوخۆ لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە پەخش دەکرا، بۆیە دەبوو من هەندێك شت بپارێزم. دوای ئەوەی من قسەکانم تەواو بوو حاکم پێمی ووت شکاتت هەیە لەکەس. وتم بەڵێ بە تەئکید شکات لە سەدام حوسێن و لە عەریف عەلی و داروودەستەکەی و هەموو ئەوانەی دەستیان سور بووە بەخوێنی ئەنفال و کورد. من بە مەبەست لە ناو هێنانی عەلی حەسەن مەجید ووتم عەریف عەلی چونکە واباس دەکرا کە ئەو عەریف بووە و لەبەر ئەوەی ئامۆزای سەدام بوو کرابووە هەموو

شتێك لە عێراق بەوە دەمویست تێبگات كە خەڵك دەزانێ تۆ لە چی ئاستێكدا بوویت، بەڵام بەداخەوە موتەرجیمەكەی دادگا قسەكەی وەك خۆی وەرنەگێڕا. دواتر حاكم ووتی داوای قەرەبوو ئەكەی، پێم ووت وەڵا نازانم هەموو دونیام بەنێ تازە پەنجەیەكی باوكم بۆ ناگەڕێتەوە بەڵام هەقی خۆشمە بۆ نا.

- **سەدام و عەلی حەسەن مەجید و هاوكارەكانیان چیان ووت كاتێ تۆ باسی بەكۆمەڵكوشتنی ژن و منداڵت دەكرد كە بەبڕیاری ئەوان و لەسەر دەستی رژێمەكەی ئەوان ئەنجام درابوو.؟**

– سەدام هیچ قسەی نەكرد، بەڵام پارێزەرەكەی سەدام رەخنەی لە دادگاو لەشێوەی بەشداری من هەبوو باسی هەندێ رێوشوێنی یاسایی شكاتكارو ئیفادە و تەحقیق و شتی وا هەبوو، لەگەڵ حاكم زۆر موناقەشەیانكرد، هەندێ پرسیاری لەسەر قسەكانی من هەبوو لە حاكمی كرد و هەر حاكمەكەیش خۆی وەڵامی دەدایەوە. پرسیاری ئەوەشی ئاراستەی من كرد ئەو چاڵانەی ئێمەیان تێكرد چۆن بوون چەند چاڵ بوو درێژی و پانی چەند بوو. وەڵامم دایەوە كە بەقەدەر دەمی شۆفڵێك و تەقریبەن دوو مەترو نیوو دەبوو. پرسیاری دەكرد نێوان چاڵێك بۆ چاڵێك چەند بوو. من ووتم مەترێ بۆ مەترو نیوێ. محامێكەی سەدام رەخنەی ئەوەی گرت كە چۆن شۆفڵ دەتوانێ بەو جۆرە چاڵ بكات یەك مەتر نێوانیان بێت و چۆن دەرچووە. دواتر

ئەیووت چۆن ئەو هەموو خەڵکەی تۆ دەیڵێت لە چاڵێکی وادا شوێنی دەبێتەوە. پرسیاری ئەوەی دەکرد ئەو دێ یە هەمووی عەرەب بوو یان کورد و عەرەبی تیاژیاوە. پێمی دەووت تۆ چۆن دەزانی ئەو ناوچەیە عەرەبی بوو. پێم ووت ناوچەکە عەرەبی دەوار نشینی لێبوو ئەرزەکەی لم بوو، نزیك بوو لە سنوری سعودیە و نزیکی نوگرەسەلمان بوو. هەندێ پرسیاری سەیری دەکرد لەوە دەچوو بیەوێ بەو هۆیەوە شتێك بەدەمما بێت ناوی گوندەکە بڵێم. بەلاّم من وریابووم دەمتوانی چۆن خۆم لەوە بپارێزم ناوەکان ئاشکرا بکەم. محامیەکی تریان پرسیاری ئەوەی کرد کە تۆ دەڵێی لە تۆپزاوا ژن و منالّەکانیان لەیەك جیاکردۆتەوە و من لەگەڵ ژنەکان بووم و بەلاّم دەڵێی باوکمیان کوشتووە، تۆ چۆن دەزانیت باوکتیان کوشت. بۆم روونکردنەوە من نەمووتووە باوکم کوژراوە، وتم کە ئەوە مەسیری ئێمە بووبێت ئەی ئەبێ مەسیری زەلامەکان چۆن بووبێت، من نازانم باوکم چی بەسەرهاتووە تا ئێستا چارەنوسی نازانم. پارێزەرەکەی سەدام هەر دەیووتەوە کە گوایە من وتوومە کە گەیشتمە کابرای دەوار نشین ووتوومە باوك و دایکم کوژراون، هەستم کرد موتەرجیمەکە لە گواستنەوەی قسەکانی مندا ئەوەی بەهەڵە وتبوو، چونکە من ووتم دایکم و سێ خوشکم، باسی باوکمم نەکرد لەوێ، ئەوەی کردبووە کێشە. رەخنەی ئەوەیان هەبوو کە من دەڵێم من عەرەبیم نازانی و ئەی چۆن عەرەبەکەم تێگەیاندووە کە کەسوکارم

کوژراوە، ئیتر حاکمەکە خۆی زۆر بۆی شەرح دەکرد بۆ ئەوەی تێی بگەیەنێ کە ئەم کوردە و عەرەبی نەزانیووە بە کوردی شەرحی حاڵی خۆی کردووە و عەرەبەکە کەمێك کوردی تێگەیشتووە.

ئەو دەیویست ئەمە بکاتە کێشەی نێوان کورد و عەرەب، دەیووت عەرەب ساحێبی غیرەتن بۆچی عەرەب تەقە لەژن و منداڵی کورد دەکات. من پێم ووت ئەمە مەسەلەی کورد و عەرەب نەبووە، ئەوان لەلایەن دەسەڵاتی باڵای عێراقەوە ئەمریان پێکرابوو ئێمە بکوژن، تەنانەت کە من دەرچووم لە چاڵەکە و چووم بۆ لای جوندیەکە خەریك بوو دەستبکات بەگریان، بەڵام ئەمریان پێکرد تەقەم لێبکات. محامێکە دەیووت تۆ ئەوکاتە تەمەنت چەند بووە وا دەزانی ئەمری پێکرابوو لەلایەن سوڵتەی عولیاوە، چۆن کەسێك لەو تەمەنە دەزانێ ئەمری سوڵتەی عولیا چیە. بەڵام حاکمەکە خۆی وەڵامی دایەوە. منیش بۆ ئەوەی پارێزەرەکەی سەدام تێبگات کە بەچاوێکی کەم تەماشای دەکەم چونکە داکۆکی لە تاوانبارانی وەك سەدام و عەلی کیمیایی دەکرد، ووتم ئەگەر پارێزەرەکەتان زیرەك بوایا چەند جارێك باسی ئەوەم کرد کە لەساڵی 1976 لە دایك بووم. دەبوو پارێزەرەکە خۆی بزانێت لە 76 بۆ 88 چەند ساڵ دەکات و چی پێویست دەکات لەمن بپرسێت کە تەمەنم چەند ساڵان بووە.

بەڵام عەلی حەسەن مەجید پرسیاری ئەوەی لێمکرد کە گەڕاویتەوە بۆ سمود کە دەڵێت ئیستخبارات پێیان زانیووم ماوەی چەند ڕۆژ لە سمود ماوەتەوە، پێم ووت بە تەواوی نازانم بەڵام ڕەنگە دە ڕۆژ مابێتمەوە، دواتر پرسیاری ئەوەی کرد کە چوویتە لادێکە ماوەی چەند لەوێ مایتەوە، پێم ووت من ئەوەی لام گرنگ بوو خۆم بپارێزم بۆیە گرنگیم بە ئەوە نەداوە بزانم کاتەکان چەند بوون، بەڵام ڕەنگە دوو بۆ سێ مانگ لەوێ مابێتمەوە. پاشان پرسیاری ئەوەی دەکرد چۆن ئەو دوو بۆ سێ مانگە بەبێ خواردن لەوێ ماومەتەوە. ئەوەش ووتم کوڕێکی ئامۆزام شوان بوو ئەو نانی بۆ دەهێنام. دواتر عەلی حەسەن مەجید پرسیاری ئەوەی کرد کە تۆ دەڵێی دەست و چاوتانیان بەستەوە کە تۆ دەست و چاوی خۆت کردەوە چۆن هەوڵت نەدا دەست و چاوی دایك و خوشك و کەسوکارەکەت بکەیتەوە. ئەی کە دەست و چاوی خۆت کردەوە چۆن جوندیەکان دەست و چاوتیان نەبەستەوە پێش ئەوەی بتخەنەوە ناو چاڵەکە. تۆ ماوەی دوو ساڵ زیاتر لەو ناوچەیە مایتەوە ئایا ئێستا ئەگەر دادگا داوات لێبکات بیانبەیتە سەر چاڵەکان دەتوانی بیانبەیتە سەر چاڵەکان. پاشان پرسیاری ئەوەی کرد لە ساڵی 1987 دەسگیرکراوم یان 1988. منیش وەڵامی هەموو پرسیارەکانی عەلی کیمیایم دایەوە کە مەسافەی نێوان ئەوەی چاومانیان بەستەوە تا چاڵەکان کەم بوو نەمدەتوانی دەست و چاوی کەس بکەمەوە. بۆ

مەسەلەی شوێنی گۆڕەکان بەڵێ ئامادەم دادگا یان هەر کەسێکی تر بیەوێ ئامادەم بیبەمە دیار چاڵەکان. ئەمزانی ئەو بەو پرسیارانە دەیویست سەر لەمن بشێوێنێ ئەگینا من چەند جارێك لە قسەکانما باسی ئەوەمکردبوو کەی دەستگیر کراووم ئەو دەیوست سەرم لێتێکبدات بۆیە دوا پرسیاریشی هەر ئەوە بوو ئایا لە 87 یان 88 گیراوم، پێم ووت ڕۆژەکەی نازانم بەڵام لە مانگی 4ی ساڵی 1988 دەستگیرکرام.

عەلی حەسەن مەجید ڕەخنەی لەوە هەبوو کە ئەوکات هیچ دێهاتێك نەمابوو لە کوردستان هەموو ئەو ناوچانە ناوچەی موحەڕەمە بوون چۆن توانیووتە لە گوندە رووخاوەکان بژیت. خۆی لە راستیا من نەگەڕابوومەوە بۆ گوندەکانی کوردستان دوای ئەوەی لە سەماوە گەڕامەوە هەر لە سمود بووم بەڵام لەوێ وام ووت.

ئەوان هیچیان بە دەستەوە نەبوو کە بتوانن نکوڵی لەو تاوانە گەورەیە بکەن کە ئەنجامیان دابوو، یان بتوانن بچوکترین بەرگری لەخۆیان بکەن، دەیانویست ڕەخنەی لابەلا لەسەر قسەکانم بدۆزنەوە. بەگشتی وابزانم ئەو جەلسەیەی بۆ شایەتی من تەرخانکرابوو سەعاتێك و پەنجا دەقەی خایاند. دادگا بەشێوەیەکی گشتی قسەکانمی پەسەندکرد و بووە پشتیوانیەکی باش بۆ چەسپاندنی حوکمی دادگا بەسەر تاوانبارانداا.

- **دوای تەواو بوونی ئەرکەکەتان وەک شایەتی لە دادگای باڵای تاوانەکانی عیراق، گەڕانەوە بۆ کوردستان یان راستەوخۆ چوونەوە بۆ ئەمریکا.؟**

– من زۆر مەبەستم بوو کە بتوانم لە عیراق بمێنمەوە و سەردانی بنەماڵەی ئالعێشم بکەم لە سەماوە و بچمەوە سەر گۆڕەبەکۆمەڵەکان، بەڵام ئەوجارە نەمتوانی چونکە لەژێر چاودێری تیمێکی ئەمریکی هێنرابوومەوە بۆ عیراق پێکەوە گەڕاینەوە بۆ ئەمریکا.

- **ئەی کەی بۆ جاری دووەم گەڕایتەوە بۆ کوردستان.؟**

– ساڵی 2009 بوو، ئەویش چۆن بوو ساڵی پێشتر لە 2008 کاک مەسعود بارزانی هات بۆ ئەمریکا، لەوێ کۆبوونەوەی لەگەڵ جالیەی کوردی سازکرد، منیش چووم بۆ کۆبوونەوەکە و کاک فازڵم لەگەڵ خۆم بردبوو، بە کاک قوباد تاڵەبانیم ووت کە کاک فازڵ بە کاک مەسعود بارزانی بناسێنێ و پێی بڵێت ئەم ماڵە عەرەبە بوون لە سەماوە منیان رزگار کردووە. لە دوای کۆبوونەوەکە کاک قوباد بە کاک مەسعود بارزانی وتبوو، کاک فازڵیان بانگکرد بۆلای و زۆر رێزی گرتبوو پێی ووتبوو حەز دەکەم بێنەوە کوردستان کەسوکارت بێن بۆلام، ئێمە قەرزداری بنەماڵەی ئێوەین و چاکەیەکی گەورەتان لەگەڵ کورد کردووە. ئیتر بیرمان لەوەکردەوە بەرنامە دابنێین بۆ

گەڕانەوە، ساڵی 2009 توانیمان بێینەوە و هاتینە سلێمانی برادەرانی یەکێتیی میوانداریان کردین و ئوتێلیان بۆ دابینکردین، کاك فازڵ پەیوەندی بە کەسوکارییەوە کرد کە وەفدێکیان بێنە سلێمانی و سەردانی بارزانی دەکەین. دوای دوو ڕۆژ کاك شێخ محمد برای و کاك حسێن کوڕی مامی کاك فازڵ هاتنە سلێمانی و ئەوەبوو جەنابیشت هاتیت بۆ لامان. تەلەفونم بۆ دکتۆر فواد حسێن کرد خۆم پێناساند و پێم ووت کە حاڵێکی وامەیە دەمانەوێ بێین سەردانی کاك مەسعود بارزانی بکەین. دوای چەند ڕۆژێك تەلەفۆنی کردەوە پێی وتین وەرن بۆ هەولێر جەنابی سەرۆك دەتانبینێت. کە چووینە هەولێر سەرەتا ناردمانیان بۆ وەزارەتی شەهیدان و کاروباری ئەنفال، لەگەڵ وەزیر دانیشتین و لەسەر ئەنفال و گۆڕەبەکۆمەڵەکان قسەمان زۆرکرد، من زۆر رەخنەم هەبوو لەسەر ئەوەی خزمەت بە کەسوکاری ئەنفال نەکراوە و هیچ نەکراوە بۆ هێنانەوەی رووفاتی ئەنفالەکان، لەسەر وەزعی گەرمیان زۆر قسەم کرد و بە وەزیرم ووت کە ئێمە مەوعدیی جەنابی سەرۆکمان هەیە و هەموو ئەم رەخنە و گلەییانە بەو دەگەیەنم. کە لە وەزارەت دەرچووین و دەگەڕاینەوە بۆ شوێنی مانەوەمان، کەسێکی دۆست لە وەزارەتەوە تەلەفونی بۆ کردم ووتی ئەوە دیدارەکەی جەنابی سەرۆك لەگەڵتان هەڵوەشایەوە، لێم پرسی بۆ.؟ ووتی لە وەزارەتەوە داوایانکرد نەتان بینێت و نارازین لەو قسانەی تۆ کردووتە. بەلامەوە سەیر بوو هیچ

شتێکم نەووتبوو کە ناڕاست بێت و گلەی و ڕەخنەی ئەوەم هەبوو کە کەسوکاری ئەنفال لە دۆخێکی خراپدان و ڕەخنەی ئەوەشم هەبوو کە ئێوە لە هەولێر پاڵتاندابێتەوە رووفاتەکانی ناو گۆڕەبەکۆمەڵەکان خۆیان نایەنەوە دەبێت بچن بیانهێننەوە، داوای مۆنۆمێنتم کرد لە گەرمیان دروستبکرێت و باسی ئەوەم کرد ئەگەر ئەنفال لە هەروڵاتێکی تر بووایا ئێستا هەموو جیهان ئاشنابوون پێی بەڵام لە سایەی ئێوەوە نیووەی میللەتەکەی خۆشمان تەنها ناوی ئەنفالی بیستووە. دیاربوو ئەوان قسەکانی منیان پێناخۆش بوو بوو، ڕەنگە ترسی ئەوەشیان هەبووبێت لای کاک مەسعودیش ئەم قسانەیان لەسەر بکەم. ئەمە بۆ من زۆر ناخۆش بوو کاک فازڵم لە ئەمریکاوە بۆ ئەوە هێناوەتەوە و دڵم بەوە خۆش بوو کاک مەسعود بارزانی لە بری هەموو کورد پاداشتی ئەو بنەماڵەیەی سەماوە دەداتەوە، ئێ دووان لە خزمەکانیشیان لە سەماوەوە لەسەر داوای ئێمە هاتوون و بەحساب مەوعیدی سەرۆکی هەرێممان هەیە. سەرم لێشێوابوو نەمدەزانی چی بکەم، مەوقیفێکی ئیحراج بوو بۆم، هەستم بە شەرمەزاریەکی زۆر دەکرد و بەڵام دەسەڵاتی هیچم نەبوو. ئەوجارە بەو هۆیەوە دیدارەکەمان هەڵوەشایەوە.

- **لە هەولێر مانەوە یان گەڕایتەوە ئەو شوێنەی لە سلێمانی بۆ مانەوەتان دیاریکرابوو.؟**

- گەڕاینەوە بۆ سلێمانی و ماوەیەکی زۆر چاوەڕێ بووین، نەمدەزانی پەنا بۆ کوێ بەرم، ئەم برادەرانەی لە سەماوەوە هاتبوون زوو زوو دەیانووت ئەگەر مەوعید تەرتیب نابێت دەگەڕێینەوە، هەستم دەکرد بەو جۆرە بچنەوە نەك هەر من بەڵکوو ئابڕوی کورد دەچێت، لەکاتێکدا ئەوان لە ناخۆشترین زروفدا ژیانی خۆیانیان خستبووە مەترسیەوە لەسەر من و ئێستا کورد حاکم و حوکمڕانین و لەو پەڕی حاڵەتی ئاسایی کوردستاندا کەس پێشوازیان نەکات. هەستام چوومە لای کاك عوسمانی حاجی مەحمود بە حوکمی ئەوەی خەڵکی ناوچەکە بوو وە سەرەتای راپەڕینیش لای خۆی پێشمەرگە بووم و کاتی خۆی ئەو حاڵەتەکەی منی بە مام جەلالی وتبوو، ئەشمزانی ئێستا ئەو لە یەکێتیی و لە حکومەت نەماوە و بووە بە گۆڕان، بەلام هیچ چارەیەکم نەبوو. کاتێ چوینە ماڵیان تەکلیفی ئەوەمکرد ئەم پیاوانە لێرەن و پێویستە کەسێك بیانبینێ و پاداشتیان بداتەوە. هەستم کرد مەوقیفەکە بۆ ئەویش ئیحراج بوو، تەلەفونێکی بۆ کاك عیماد ئەحمەد کرد و مەسەلەکەی بۆ گێڕایەوە، لە کاك عیماد مەوعیدی بۆ وەرگرتین و بۆ بەیانی چووینە لای کاك عیماد زۆر حورمەتی گرتین و زۆر سوپاس گوزاری بۆ ئەو ماڵە دەربڕی و سەیارەیەکی لاندکرۆزەر (مۆنیکا) و دەمانچەیەکیش لێی نوسرابوو هەدیەی رەیس جمور، بەدیاری دایی پێیان. ئەمە بۆمن خۆش بوو کەمێك هاتمەوە سەرخۆم و هەستمکرد لە ئیحراجی رزگارم بوو،

بەڵام هەر دەمویست هەرچۆنێك بێت بچینە لای كاك مەسعود بارزانی، چونكە ئەوكاتەی لە ئەمریكا كاك فازڵی بینی بوو ئەوەنە رێزی لێی گرتبوو كاك فازڵ حەزی دەكرد كە بچینەوە بۆلای و دەیووت من لە ئەمریكا وەعدم پێی داوە لە كوردستان سەری لێبدەم. بیرم كردەوە بچین بۆلای كاك كۆسرەت جێگری سەرۆكی هەرێم و دوایش داوا لەو بكەم دیدارێكی كاك مەسعودمان بۆ رێكبخات. تەلەفونمان بۆ نوسینگەكەی كردو خۆمان ناساند و داوای دیدارمان كرد، چەند رۆژێكی پێچوو وتیان وەرنە هەولێر دەتانبینیٚ، چووین و نەمان بینی و ناردمانیانەوە ووتیان كەی گەڕایەوە سلێمانی وەرن بۆلای. ئێمەش چووینەوە بۆ گەرمیان بۆ سەردانی ئەو كەسوكارە، نوسینگەی كاك كۆسرەت تەلەفونیان كرد وەرن بۆ سلێمانی و مەوعیدەكەتان تەرتیب بووە، هاتینە سلێمانی چەندجارێك تەلەفونمان كردەوە بچینە كویٚ، وەڵامی تەلەفونەكەیان نەداینەوە. لەوێش بیٚ ئومێدبووم و بڕیارمدا هەرچۆنێك بێت سەر لە هیرۆخان بدەین و بزانین لە رێگەی ئەوەوە بچینە لای مام جەلال، تەلەفونم بۆ سكرتێرەكەی كرد و پێم ووت ئەوە لێرەین و دەمانەویٚ سەردانی بكەین، هیرۆخان خۆی دەمیناسی و حاڵەتەكەی منی هەمووی دەزانی، زوو وەڵامیان داینەوە و چووینە لای، ئەویش زۆر رێزی گرتین و تەلەفونی كرد بۆ مام جەلال كە لێرەن و دەیانەویٚ بێن سەرت لێبدەن، مام جەلال لە بەغدابوو وتی من خۆم لەم رۆژانە

دێمەوە سلێمانی، کرا لەوێ دەیان بینم، ئەگەر نەهاتمەوە بابێنە بەغدا.

- **مام جەلال هاتەوە بۆ سلێمانی، یان ئێوە چوونە بەغدا.؟**

– بەڵێ مام جەلال گەڕایەوە سلێمانی و وابزانم چەند ڕۆژێك دوای گەڕانەوەی بوو دەعوەتی کردین، ڕۆژەی 2009/6/21 بوو من و کاك محەمەد گتێل عێشم و کاك فازڵ گتێل و حسێن فالح سەفاح چووین لە دەباشان بینیمان، مام جەلال دەیزانی ئێمە جافین کە چووین بینیم ئەو جافانەی لەناو یەکێتیی بەرپرسیارێتیان هەیە دەعوەتی کردبوون، کاك مەحمود سەنگاوی کاك حامی حاجی غالی و کاك عەدنان حمەی مینا و کاك بەهرۆز گەلاڵی لەوێ بوون و پێشوازیەکی گەرمیان لێمان کرد. زۆر لەگەڵمان دانیشتن مام جەلال زۆر سوپاسی ئەو بنەماڵەیەو عەشیرەتەکەیانی کرد، کە ئێوە ژیانی خۆتان خستۆتە بەر مەترسی لە سێدارەدانەوە و پێی ووتن بەیارمەتیدانتان و ڕزگارکردنی تەیمور فەزڵێکی گەورەتان تۆمارکرد لەسەر برایەتی کورد و عەرەب و یەکێتیی عیراقیەکان، لەوێ مام جەلال بەڵێنی پێیاندا کە بنکەیەکی تەندروستی و خوێندنگەیەکی ناوەندی لە گوندی (ئالعێشم) دروستبکات و ئامادەیشی دەربڕی بۆ هەر پرۆژەیەکی تر لە گوندەکەیان، کۆمەڵێ ستایشیانی کرد. کاك حسێن ووتی کەسوکارمان حەز دەکەن سەردانی کوردستان بکەن

بێن بۆلای تەیمور، مام جەلال ووتی پێویست ناکات ئەوان زەحمەت بکێشن تەیمور خۆی دەتوانێت سەردانی خزمانی ئێوە بکات و من تەرتیبی دەکەم حیمایەیان بۆ دابین دەکەم ئەمان دێنە خزمەتی ئێوە. لە راستیا من خۆم دامنابوو تەکلیف لە مام جەلال بکەم یارمەتیمان بدات بتوانین بچینەوە بۆ سەماوە بۆ ماڵی ئەو بنەماڵەیەو بۆ سەردانی گۆڕەبەکۆمەڵەکان، بەڵام ئەتووت ئەو لە دڵی مندایە پێشم کەوت و وایووت. شەو لە تەلەفزیۆن هەواڵی ئەو سەردانەی ئێمە بۆ لای مام جەلال لە کەناڵەکانی یەکێتیی بڵاوکرایەوە و بۆ بەیانی رۆژنامەی کوردستانی نوێ رەسمەکەمانی لەگەڵ مام جەلال دانابوو بە ناونیشانێ گەورە نوسیبووی سەرۆك مام جەلال بەڵێنیدا بنکەیەکی تەندروستی و خوێندنگەیەکی ناوەندی بۆ گوندی (ئالعێشم) دروست بکات.

دوای ئەوە کاك حسێن و کاك محەمەد گەڕانەوە بۆ سەماوە، لەوێ باسی سەردانەکەی مام جەلالیان کردبوو وە بە خەڵکی گوندەکەیان وتبوو کە مام جەلال قوتابخانە و خەستەخانەمان بۆ دروست دەکات، ئەو کاتەی ئێمە چووین ئەو هەواڵە لەناویاندا بڵاو بوو بووەوە. چەند رۆژێکی پێچوو سکرتاریەتی مام جەلال تەلەفونیان بۆ کردم ووتیان هەموو ئامادەسازیەکمان کردووە و هەرکات ویستتان ئێمە حازرین. پێمخۆش بوو هەندێ لە خزمەکانم لەگەڵ خۆمان بەرین مامم رەوف و کاك عوسمان مێردی پورم و کوڕێکی پورزام بەناوی ساڵح عەبدوڵا و

حسێنی خاڵم و سەرداری ئامۆزام و کاك فازڵ کە لە ئەمریکاوە پێکەوە گەڕابووینەوە، چووینە فڕۆکەخانەی سلێمانی و بە تەیارە چوینە بەغدا، لەوێ سکرتاریەتی مام جەلال هاتبوونە فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی بەغدا و بردمانیانە میوانخانەی سەرۆك کۆمار

- **چی ڕۆژێک بوو بەڕێکەوتن.؟**

– وەڵایی لە ڕاستیا نازانم.

- **نازانی مانگی چەند بوو.؟**

– وابزانم سەرەتای مانگی تەموز بوو، بەڵام ڕۆژەکەی نازانم. ئیتر کە گەیشتینە بەغدا شەو لەوێ ماینەوە و بەیانی زوو بە حەوت سەیارەی سکرتاریەت بە پاسەوانییەکی توندوتۆڵەوە کەوتینەڕێ بەرەو سەماوە. یەکەمجار کە گەیشتینە دەروازەی شارەکە سەیارەیەکی ئەوانیش هاتبووە پیریمانەوە وەکوو دەلیل بەناو شارەکەدا پێشمان کەوت، هەرچەندە ئێمە کاك فازڵمان لەگەڵ بوو خۆی شارەزا بوو بەڵام دیاربوو خۆیان وایان بەچاك زانیبوو سەیارەیەك بنێرن لەگەڵمان. کاتێ چووینە ناو سەماوە وە ڕەتڵی سەیارەکانمان بەدوای یەکترییەوە بوون و سەیارەیەکی پۆلیسی پارێزگاکەش کەتبووە پێشمان و شوتی لێئەدا، خۆشمان سەیارەی پاسەوانی و دۆشکە لەپێشمانەوە دەڕۆیی، دور نیە ئەو ڕۆژەی براین

بۆ گووللەبارانكردن هەر بەو شێوەیە كاروانی سەیارەكانمان بەناو سەماوەدا تێپەڕیبن، بەڵام ئەوكاتە ئێمە لەناو سەیارەكانەوە دەرەوەی خۆمان نابینی و موقەپەت بوون، بەڵام هەستم دەكرد ئاوا بەسەر ئەو جادەیەدا ڕۆیشتووین و خۆمانم دەهاتەوە بەرچاو كە لەناو سەیارەكە لە تینوا و لە گەرما چۆن خەریك بوو ڕۆحمان دەردەچوو. سەرەتا چووینە ئەوماڵەی كە لە ساڵی 1988 وە من لەماڵیان بووم تا داگیركردنی كوێت و نزیك راپەڕین، لەوێ ئەویش هەندێك لە خزمەكانی كۆكردبۆوە ئەوەندەی تر من توشی شەرمەزاری بوم كە ئەو هەموو چاكەیەیان لەگەڵ كردبووین و ئێستاش خزم و كەسوكاری هێنابووە پێشوازیمان. پرسیاری كاك غانمم كرد ئەو پیاوەی یەكەم شەو بردمیە رەشماڵەكە و ئیتر لەوكاتەوە نەمبینی بوو، تەنانەت ئەو ماوەیەش لە سەماوە بووم و دەچوومە ئالعێشم ئەوم هەر نەبینی و كە پرسیارم دەكرد دەیانووت لە حدود سعودیەیە، بەڵام ئەمڕۆ ئەویش لەوێ بوو، كاك عەبد باوكی خالد ئەو پیاوەی لە رەشماڵەكەوە بردمی بۆ ئالعێشم ئەویش لەوێ بوو، ئەو ژنەی ووتم لە رێگە ئەوكاتانەی سەیارەی سەربازییمان توش دەبوو عەباكەی ئەدایە سەرما، ناوی خۆی نازانم بەڵام پێیان دەووت (ئوم دلەیل) ئەوان پیاوەكان و ژنەكانیش بەناو مناڵەكانیانەوە بانگ دەكران، ئەو رۆژەی ئێمە چووین ووتیان ماوەیەكە زۆر نەخۆشە لە نەخۆشخانە كەوتووە چووم سەرم لێداو

تاوێ لەلای مامەوە. ئیتر هەموو کەسوکارەکەی هاتن بۆلامان، لەلایەکیش بۆ من خۆش بوو کەسوکاری هەردولامان یەکتریان ناسی. لەوێ مامە رەوفم هەندێ قسەی کردو سوپاسی ئەو بنەماڵەیەی کرد کە منیان گرتبووە خۆیان و مامم ووتی داوای لێبوردنتان لێدەکەین کە ئێمە لەو ساڵەوە تەیمورمان بردۆتەوە نەمانتوانیووە بێینەوە خزمەتتان و روو زەردی لای ئێوەین، بەڵام خۆتان دەزانن زروفەکەش بۆ ئێمە چۆن بووە و ئەم چەند ساڵەش هەتا سەدام مابوو ئێمە هەر نەمان ئەتوانی بێینە ئەم ناوچانە. بەخوا وانەبوایا ئەگەر هەموو مانگێك لە ناوچەکەی خۆمانەوە بەپێ بهاتینایا بۆ خزمەتتان هەر خۆمان بەقەرزارتان دەزانی. هەڵوێستێکی تری سەیرم لێیان بینی ئەوان سوپاسی منیان دەکردو دەیانووت تەیمور ئینسانێکی شەریف بووە ئەگەر بەهەر جۆرێك لەو بیست ساڵەیا ناوی ئێمەی بهێنایا ئەوە هەموو بنەماڵەکەمان وەك (دوجەیل)ی بەسەر دەهات حکومەت هەموومانی ئیعدام دەکرد. ئەیانووت ئێمە لە 1988 وە تا 2003 لە موعاناتدابووین و هەمیشە ترسی ئەوەمان هەبووە حکومەت بەوە بزانێت و هەموومان لەناو بەرێت.

ئەو نیوەڕۆیە پێکەوە نانمان خوارد و دواتر چووین بۆ بیابانەکان بۆ دۆزینەوەی گۆڕەبەکۆمەڵەکان کە نزیکەی دوو سەعات دوور بوو لە سەماوەوە، ماوەیەك گەڕاین نەماندۆزییەوە لە کاتێکدا هەندێ لە خزمەکانیان و کاك غانمیشمان لەگەڵ بوو کە ئەو مەڕدار بوو بۆ

لەوەڕاندنی مەڕەکانیان ڕەشماڵ نشین بووبوو لەو ناوچەیە، بەڵام چونکە هەمووی هەر سەحرا بوو هەموی لەیەك دەچوو زۆر گەڕاین و هەندێکیان خەریك بوو بێ ئومێد دەبوون لەوەی بیاندۆزینەوە، ئەوکاتەی ئێمەیان بردە ئەو ناوچەیە بۆ کوشتن کە لەسەیارەکە دایانگرتین خۆرئاوابوون بوو، کاتێك منیش لە چاڵەکە دەرچووم شەو بوو، بەیانیەکەشی کە بە لۆریەکە کەوتینەڕێ بەرەو گوندەکە بەهۆی ترس و ئازاری برینەکانیشمەوە ئەوەندە سەیری ناوچەکەم نەکرد، بەڵام ئەمجارە کاتێ چووینەوە ئەو سەحرایە بینیم هەمووی لم بوو تا چاو بڕی دەکرد دەشتێکی خۆڵەپەتانی جگە لە دڕکی (عەگول) هیچی لێسەوز نابوو نازانم ئەو مەڕانە لەوێ چیان دەخوارد باوەڕێکم لا دروست بوو کە ڕەنگە خوا تەنها بۆ ڕزگارکردنی من ئەو مەڕدارە عەرەبەی ناردبێتە ئەوێ. ئێستاش وەك یەکەم شەو کە بەو ناوچەیەدا تێپەڕیم تا دەهات دڵم توندتر دەبوو، وەك ئەوەی ڕوحیانەتی دایکم و خوشکەکانم ڕێنوێنیم بکەن و بانگم بکەن بۆ لای خۆیان، هەستم دەکرد زۆر نزیکین لێیانەوە. پێم وتن ئێوە شوێنی ڕەشماڵەکەی ئەو ساڵەم پێ بڵێن لە کوێ بوو من خۆم لەوێوە دەزانم لەچی ئاراستەیەکەوە هاتبووم دەیدۆزمەوە. گەڕان تا شوێنی ڕەشماڵەکەی خۆیان دۆزییەوە، لەوێ من ئەو شوێنەم ناسیەوە کە سەگەکان دەوریان گرتبووم و بەو هۆیەوە دەمزانی لە چی

ئاراستەیەکەوە هاتبووم. بەپێی بیرکەوتنەوەی من و شارەزایی کاک غانم ئاراستەکەمان گرتەبەر.

ئەوکاتە پاش نیوەڕۆیەکی نزیك عەسر بوو، بەڵام بڕوابکەن ئەو بیابانە جار جارێك لەبەرچاوم دەبووەوە شەو، وەك ئەو شەوەی تیایدا گوللەباران کراین، کاتێ هەر هەنگاوێکم دەنا، زۆر بەهێواشی پێم دادەنایەوە دەترسام ئەو لمەی پێدەخەمە سەری لە ژێریدا ئێسك و پروسکی دایکم و رووفاتی کەسوکارەکەمی تیابێت، ئێوە بیهێننە پێشچاوی خۆتان بە رێگایەکدا بڕۆیت هەست بکەیت ئێسك و پروسی ئازیزترین کەست کە دایکتە لەژێر پێتدایە چی ئازارێکی گەورەیە، ناچاریش بووم بەردەوام بم لە رۆیشتن و گەڕان تا بیاندۆزمەوە. دڵنیام ئەگەر خاکی ئەوێ وەك کوردستان بوایا ئەوە پێویستی بەهیچ گەڕانێك نەبوو لە رووحی هەموو ئەو خەڵکە بێتاوانەوە گوڵاڵە سوورە سەوز دەبوو، سەر گۆڕەکانیان دەبووە نێرگزەجاڕ، بەڵام خاکی ئەوان لە دڕك زیاتر هیچی لێ سەوز نابوو. ئەو ئاراستەیەی لە شوێنی رەشماڵەکەوە گرتبوومەبەر تەواو دڵنیابووم دەمباتەوە سەر گۆڕەبەکۆمەڵەکان، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو دەشتە هەموی لم بوو زەویەکەی کردبووە پارچەیەك تەختایی، بەچاو هیچ پارچەیەك لە پارچەیەکی تر جیا نەدەکرایەوە، دەبوو بەرۆح بەدوای رۆحی دایکم و خوشکەکانمدا بگەڕێم، سەدانجار ئەو دەشتەم دەهێنایەوە پێشچاو خۆم، ئەو رۆژەم دەکردەوە شەو،

هەموو دیمەنەکان لە رەتلّی سەیارەکان و لە چاڵەکانی مەرگ و لە عەسکەرە جەلادەکان و ناو چاڵەکە و یەکە یەکەی فیشەکەکان و ئەو پریشکە گۆشتانە دەهاتەوە بەرچاوم کە لە شوێنی گوولەکانەوە دەردەپەڕین، من ئەو شەوەی لێرە گوولەباران کراین و بە بەرچاومەوە جگە لە دایك و سێ خوشکی خۆم، زیاتر لە مەرگی شەست کەسی ترم بینی، کاتێ دوای 21 چووبوومەوە ئەو شوێنە و هەستم دەکرد هەنگاوەکانم ئەو شوێنپێیانەیان گرتۆتەوە کە 21 ساڵ لەمەوبەر بە برینداری لەوێوە تێپەڕیم، ئەو شەوەی بە ناهەق گوولەبارانیانکردین وەك ئەم چرکەساتە ئازارم نەبوو کە دوای 21 ساڵ گەڕابوومەوە بیابانەکە. لە خۆمەوە دەمم دەکرایەوە و هەناسەکانم درێژتر دەبوون، هەموو موی لەشم بەرز بووبوونەوە و گیانم کەوتبووە لەرزین، نازانم دەمویست هاوار بۆ خوا بکەم یان دەموویست دایکم و ئەوان گوێیان لێم بێت. بە هەست و بە رۆح شوێنەکەم دۆزییەوە. چونکە کاتی خۆی 21 ساڵ لەمەوبەر کە بە شۆفلْ خۆڵەکەیان کردبوو بە سەریاندا لەگەڵ زەویدا تەختیانکرابوو. بەڵام هەرچیەکیان لەو زەویە بکردایا من هەر دەمناسیەوە و لە مێشکمدا چەسپا بوون. شوێنی هەموو چاڵەکانم بۆ هاوڕێکانم دیاریکرد کە جگە لەوەی ئەو بنەماڵە عەرەبە کۆمەڵێك خزم و کەسیان لەگەڵم هاتبوون، مامم رەوف و کاك عوسمان مێردی پورم و کوڕێکی پوورزام بەناوی ساڵح عەبدوڵا و حسێنی خاڵم و سەرداری

ئامۆزامم لەگەڵ بوو. هەستم دەکرد بۆ ئەوانیش وەك من ئازار بەخش بوو. چونکە هەمووی خوشك و خوشکەزاو برازاو کۆمەڵێك کەسی ئەوان بوون. لەناو سەیارەکە هەموویان دەگریان و بە بینینی ئەو بیابانە سەحراو چۆڵەوانیە هاواریان لێبەرز بووەوە بانگیان دەکرد براکانم خوشکەکانم هەموو کەسوکارەکەم لەکوێن، ئیتر ئەوەنەی تر ئازر بەناخما شۆڕ دەبۆوە، من پێشتر هەوڵم دەدا ئەوان هەست بەو خەمە قوڵەی من نەکەن و خێرا خێرا جگەرەم دادەگیرساند نەوەکوو ئەوان بە بینینی من ئازار بچێژن، بەڵام ئێستا بینیم وەك ئەوەی بەدیار تەرمی کەسوکارەکەیانەوەبن ئاوا شیوەنیان دەکرد.

- **هیچ یەکێک لەو گۆڕەبەکۆمەڵانەتان هەڵدایەوە بۆ دڵنیابوون لەوەی کە رووفاتەکانی تیایە.؟**

– نەخێر چی پێویستی بەوەبوو هەڵیانبدەینەوە تا دڵنیابین، لەکاتێکدا من خۆم هەموو ناوچەکە وەك فلیم لەبەرچاوم بووە. لە شوێنی گوولەبارانکردنەکەمان هێشتا بەشێك لە قەوانی ئەو فیشەکانە مابوون کە بە جەستەی ئێمەوەنرابوون، تەنانەت هەندێ لەو فیشەکانەشمان دۆزییەوە کە چووبوونە لاشەی کەسوکارەکەمانەوە و ئێستا دوای ئەوەی تەنها ئێسکیان مابوو فیشەکەکان کەوتبوونە سەر زەوی. بەشێك لەو فیشەك و قەوان و مەخزەنانەم هێناوەتەوە کە لە شوێنی بەکۆمەڵکوشتمان مابوونەوە. تەنانەت شەرواڵێکی

بچوکی کوڕانەی پێنج شەش ساڵەو فانیلەیەکی پەمەیی کچانەشم هێنایەوە کە ڕەنگە بۆ تەمەنی حەوت بۆ هەشت ساڵان بێت، کە دیارە کاتی خۆی سەگ تەرمەکانی دەرکردووە و خواردویانێتی چونکە تەنها چەند ئێسکێك لە ناویا مابوونەوە.

- **پێت وانیە ئەو جلە کچانەیەی باسی دەکەیت جلی هەمان ئەو کچە بێت کە بە زیندوێتی لەناو چاڵەکەیا بەجێتهێشت.؟**

– نازانم، لەبەر ئەوەی شەو بوو ناو چاڵەکە تاریك بوو لە ڕاستیا نازانم کچەکە چی جلێکی لەبەر بوو. بەڵام هیچ دوور نیە ئەویش دوای من دەرچووبێت و نەیتوانی بێت لەو شوێنە دورکەوتبێتەوە، دواتر لە تینوا خنکابێت یان لە برسا مردبێت یان سەگ خواردبێتی. بەڵام ئەم فانیلەیە کەمێکی لەژێر لمەکە بوو کەمێکی بە دەرەوە بوو. بە دڵنیاییەوە ئەگەر هی ئەویش نەبووبێت ڕەنگە جلی پورزا و خاڵۆزاکانی خۆم بووبێت.

هەر لە تەنیشتی ئەو چاڵانەی ئێمەیان تیا بەکۆمەڵکوشت، کۆمەڵێك گۆڕی بەکۆمەڵی تریشمان دۆزییەوە کە پێدەچوو ئەوە دوای ئێمە بووبێت، چونکە ئەو شەوەی ئێمە براینە ئەوێ من تەنها چاڵەکانم بینی، ئەو شوێنانەی ئەمجارە چووین گۆڕی بەکۆمەڵ بوون ئەوکاتە تەخت بوو، بەڵام ئێستا ئەمان خۆڵەکەی سەریان هەر بەرز بوو وەك گردۆڵکەی بچووك بچووك. لەوێش کۆمەڵێ پەڕۆی ڕەشم هێنایەوە

لەناو لم و خۆڵەکە بوون ئەو پەڕۆیانە هی ئەو کاتە بوو کە چاوو دەستی خەڵکەکەیان پێبەستبوونەوە پێش ئەوەی گوولەبارانیان بکەن. ئێستا ئەو شتانەم هێناوەتەوە و ئەگەر رۆژێك مۆنۆمێنتێکی شایسە بە ئەنفال و گۆڕەبەکۆمەڵەکان دروست بکرێت، پێشکەشی ئەوێی دەکەم. لەسەر گۆڕەبەکۆمەڵەکان تەماشام کرد ئەو کوڕانەی خزمم کە لەگەڵم هاتبوون خۆڵی سەر گۆڕەبەکۆمەڵەکانیان دەکردە ناو مەتارەیەکی بچوکەوە و هێنایانەوە بۆ کوردستان، ئەو دیمەنە ئەوەنەی تر ئازاریدام. کاتێ تەماشای چواردەوری خۆمانم دەکرد کۆمەڵێك سەرباز بە دەوورمانەوەن ئەمانیش جلەکانیان بەڵەك بەڵەکی سەوز و بۆر بوو، بێریەکانیان سور بوو. هەمان دیمەنەکانی کاتێ گوولەبارانکردنەکەم دەهاتەوە پێشچاو کە پێش 21 ساڵ لەمەوبەر لە هەمان شوێن کۆمەڵێك سەربازی عیراقی بەهەمان رەنگی جلوبەرگەوە ئێمەیان بۆ کوشتن هێنابوو بۆ ئێرە، هیچ دوور نەبوو ئەو سەربازانەی ئەوکاتەش فەوج و لیوای تایبەتی حەرەس جمهوری بووبێتن. بەڵام ئێستا ئەم سەربازانە کە لە فەوج و لیوای حەرەس جمهوری بوون بۆ پاسەوانیکردنمان هاتبوون. ئەوە دونیایە رۆژێك عەسکەری عیراق لەوێ هەموو کەسوکارەکەمیان کوشت و ئەمڕۆش عەسکەری عیراق لەگەڵم هاتوون بۆ دۆزینەوەی ئێسك و پروسکەکانیان، دەمبینی ئەوانیش وەك من ئازار دەچێژن، پارچە ئێسکی بچوکیان بەرچاو دەکەوت کۆیان دەکردەوە، قەوانە

ژەنگاویەکانیان هەڵدەگرت وەك یادگاریەك كە بە گوولەی ناو ئەم قەوانانە سەدان ژن و منالّی کورد بەکۆمەڵ کوژراون.

- **ئەمجارە کۆمەڵێک خەڵکت لەگەڵەو دونیا رۆژبوو، ئێستا دەزانی چەنێک لە شوێنی رەشماڵی مەرداری عەرەبەکانەوە دور بوو.؟**

– بەڵێ بە سەیارە رەنگە هەر دە دەقە لە رەشماڵەکەوە دوور دەبوو.

- **کاتی خۆی نازانی تۆ ئەو ماوەیەت بە چەنێک بڕی.؟**

– ناوەڵا نازانم، رەنگە لە ترسا زۆر زوو گەیشتبێتم و دووریش نیە زۆر زۆرم پێچووبێت تا گەیشتوومەتە ئەو دەوار نشینە، چونکە ئەوە نەبوو شوێنەکە لە منەوە دیاربێت و منیش بە دیاریکراوی ئەو ئاراستەیەم گرتبێتەبەر، من چەندینجار ئاراستەکەم گۆڕی و بەڕێککەوت رێم کەوتە لای ئەوان، ئێستاش نازانم ئەو شوێنە بەپێ چەنێك دوورە لە دەوارنشینەکەوەو نازانم من بەچەنێك بڕیوومە. لەو کاتەوە ئیتر من کاك غانمم نەبینیەوە تا لێی بپرسم بەڵام ئەمجارە کە چووینەوە کاك غانم لە شوێنی رەشماڵەکە وتی ئێمە توشی سەرسوڕمان هاتووین کاتێ بەو نیووە شەوە تۆمان بینیووە چونکە ئەم ناوچەیە نەك ئاوەدانی تەنانەت گورگیشی لێنیە کەچی تۆ سەعات 12ی شەو مانگی پێنجە دنیا تاریك و گەیشتیتە ئێرە، ئیتر نازانم سەعات چەند لە شوێنی گوولەبارانکردنەکە کەوتبوومەڕێ،

ئێمە کاتێك گوولله‌بارانکراین تازە خۆرئاوا بووبوو، بەڵام تا ئەو یەك دووجارەی هەستام و دەبورامەوە نازانم دەخەوتم، ئەوکاتەی بەیەکجاری بەڕێکەوتم شەو داهاتبوو بەڵام بەڕاستی نازانم سەعات چەند بوو. لەوێ شتێکی تریشم بۆ دەرکەوت ئەو رۆژەی لە رەشماڵەکەوە بردمیان بۆ گوندەکەیان کە ووتم نازانم سەیتەربوو چی بوو رایانگرتین کاك عەبد دەیووت ئەوکاتەی لە رەشماڵەکەوە تۆمان بردووە بۆ گوندەکە لەڕێگە من سەیارەکەم بەخێرایی لێدەخوڕی تا زوو بتگەیەنینە ئاوایی، ئەو سەیتەرە سەربازیانەی رایانگرتووین مەفرەزە بوونە پێمیان دووت بۆچی سەریع دەڕۆیت، منیش پێم وتوون نەخۆشم پێیە.

- **ماوەی چەند رۆژ لە سەماوە و ئالعێشم و بیابانەکان مایتەوە.؟**

– یەك شەو و دوو رۆژمان پێچوو تا گەڕاینەوە بەغدا، چونکە ئێمە ژمارەیەك پاسەوان و سەیارە و برادەرانی سکرتاریەتی مام جەلال لەگەڵمان بوون و دەبوو بگەڕێینەوە چونکە ئەوانیش ئەرك و کاری تریان زۆر بوو لەبەر ئێمە هاتبوون. هەر ئەو رۆژەی چووینە سەماوە لەوێوە رۆیشتین بۆ سەر گۆڕەبەکۆمەڵەکان و ئێوارە گەڕاینەوە بۆ گوندی ئالعێشم، ئەو گوندەی دنیایەك یادگاری منی لێبوو، هاوڕێی رۆژی تەنگانە و ماڵی چەند برایەك کە تا ئەو رۆژەی دەمرم ناتوانم قەرزەکانیان بدەمەوە. لەوێ ئیدارەی پارێزگاکە مەراسیمێکی

گەورەیان لە گوندەکە بۆ سازکردبووین کاتێ چووینە ئەوێ پێشوازیەکی گەورەیان کردین رەنگە سەد سەرۆك عەشیرەتی خێڵەکانی پارێزگاکە ئامادە بوبوون، خەڵکێکی زۆر زۆر لە پێشوازیمان بوون، کەسایەتی سیاسی و ریش سپیانی مەنتیەقەکە هەموو لەوێ بوون، (ئیبراهیم مەیالی) پارێزگاری سەماوە و (محمد عربوت زیادی) جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگا و ژمارەیەك ئەندامانی ئەنجومەنەکەیان لەوێ بوون. مونەسە و مایکرۆفۆنیان دانابوو، سەرەتا سەلاواتیان بۆ پێغەمبەر نارد، پاشان هەموو خەڵکەکە هەستانە پێوەو فاتیحایان بۆ گیانی ئەنفالەکان خوێند. کابرایەك مەراسیمەکەی بەڕێوە دەبرد دیاربوو شارەزابوو باسی ئەوەی بۆ خەڵکەکە کرد کە ئەم مەراسیمەیان بۆ ئەوە سازکردووە کە لە ساڵی 1988 کاتێ سەدام ژن و منداڵی کوردی هێناوە لەم ناوچەیە کوشتویانێتی تاکە منداڵێك بەناوی تەیمور لەناو گۆڕەبەکۆمەڵەکان رزگاری بووە و عەشیرەتی ئالعێشم گرتویانەتە خۆیان و پاراستویانە، ئەمڕۆ تەیمور لەگەڵ هەندێك لە خزمەکانی هاتوونەتەوە بۆ ئەم گوندە بۆ ئەوەی سوپاسی ئەم بنەماڵەیە بکەن، وە ئێمەش ئەم مەراسیمەمان بۆ پێشوازی لە تەیمور و بۆ سوپاسی بنەماڵەی ئالعێشم سازکردووە. دواتر جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگای (موسەنا، سەماوە) لە مەراسیمەکەدا وتاری خوێندەوە و بەخێرهاتنیان کردین و باسی برایەتی و پێکەوەژیانی کورد و

عەرەبیان کرد، وە سوپاسی عەشیرەتی ئالعێشمیان کرد بۆ ئەو هەڵوێستەیان کە لە سەردەمی ترس و تۆقاندنی سەدامدا ژیانی بنەماڵەکەیان خستبووە مەترسیەوە بۆ رزگاربوویەکی ناو گۆڕەبەکۆمەڵەکان، بەوە پەیامی برایەتی نێوان کورد و عەرەبیان نوێ کردەوە. دوای ئەوە حسێن هاوڕێی سەردەمی منالّیم شیعرێکی جوان و دووردرێژی پێشکەش کرد. وتارێکیشیان دانابوو بۆ من، منیش بەدرێژی باسم لە پەیوەندی لە مێژینەی کورد و عەرەب کرد لە سلاحەدینی ئەیوبیەوە تا ئێستا کە کورد و عەرەب وەك دوو نەتەوەی دراوسێ پێکەوە ژیاون و رێزو خۆشەویستی و هاوکاری لەنێوانیاندا هەبووە، بەلاّم سەدام دەیویست بە ئەنفال و کیمیابارانکردنی کوردستان درز بخاتە نێوانمانەوە، بەلاّم نەیتوانی ئەوەتا سەدام رۆیی و ئێستا کوردێك سەرۆك کۆمارە، ئەوە من تاکە منالّی رزگاربووی ناو گۆڕەبەکۆمەڵەکانم ئەم بنەماڵە عەرەبە منیان رزگارکردو زیاتر لە دوو سالّ بەخێویان کردم. وە هەواڵی ئەوەشم پێراگەیاندن کە مام جەلال بڕیاریداوە لەسەر بودجەی خۆی قوتابخانەیەك و نەخۆشخانەیەك لەم گوندە دروستبکان، ئاگام لێبوو زۆریان پێخۆش بوو. پێمیان ووت کە ئێمەش بۆ حورمەتی کورد ناوی قوتابخانە و نەخۆشخانەکە بەناوی نەخۆشخانەی کوردستان و قوتابخانەی کوردستانەوە ناو دەنێین.

دوای منیش وتارێك بەناوی بنەماڵەی ئێمە و ئەنفالەکانەوە لەلایەن کوڕێکەوە پێشکەش کرا ناوی ئەبوو کاوە بوو کوردێك بوو دیار بوو لە زوەوە ماڵیان لە سەماوە بوو، مامم و ئەوان پێیان خۆش بوو ئەو لەجێی بنەماڵەکەمان قسە بکات چونکە ئەو دوو رۆژە هەر لەگەڵمان بوو. وتارێکیش بەناوی گوندی ئالعێشم لەلایەن (کامل شەلال) بەنوێنەرایەتی گوندەکە خوێندرایەوە. ئێوارە لەوێ نانخواردنیان ئامادە کردبوو بەخوا رەنگە بیست هەر مەڕیان سەربڕی بێت، خێوەتی گەورەیان هەڵدابوو بۆ میوانەکان و میوانداریەکی گەورەیان کردین. شەو لەوێ ماینەوە و بۆ رۆژی دواتر گەڕاینەوە بەغدا و ئێمەش رۆژی دوای ئەوە هاتینەوە بۆ کوردستان.

- **کاك فازڵ کە لە ئەمریکاوە پێکەوە گەڕابوونەوە کوردستان، ئەویش لەگەڵتان هاتەوە یان لە سەماوە مایەوە.؟**

– ئا، باش بوو باستکرد بەڵێ کاك فازڵ و هەندێ لە برادەرەکانی سەردەمی منالیم کوڕو برازاکانی ئەو ماڵەی لێی بووم لەگەڵمان هاتن بۆ کوردستان، حسێن و خالد و محمد چەند رۆژێکیش ئەوان میوانی ئێمە بوون، چووینە کەلار و هاتینەوە سلێمانی و چووینە هەندێ لە هاوینە هەوارەکانی کوردستان، هەرچەند بەهۆی ئەوەی من چووبوومەوە سەر گۆڕەبەکۆمەڵەکان و لەناخەوە گەڕابوومەوە بۆ ئەو ساتانەی کەسوکارەکەمی تیا کوژران، ئارەزووی ئەوەم نەبوو

بچمه گەشت و سەیران، بەلاّم لەبەر ئەوەی ئەوەندە خۆم بە قەرزاری ئەو بنەماڵەیە دەزانی بۆیە رۆیشتم و لەگەڵیان چووم بۆ گەشت و سەیران، بۆ ئەوان سروشتی کوردستان وەك بەهەشت وابوو، زۆر دڵیان بەو سەردانیە دەکرایەوە و کەیفخۆش بوون پێی. ئەوان گەڕانەوە بۆ سەماوە و من و کاك فازڵ ماینەوە بەهیوای ئەوەی سەردانی کاك مەسعود بارزانی بکەین و بگەڕێینەوە بۆ ئەمریکا. ماوەیەکی تر لە سلێمانی مامەوە و هەر چاوەڕێ بووم رێگایەك بدۆزمەوە بەهۆیەوە بگەینە لای کاك مەسعود، رۆژێك کاك نوری حەمە عەلیم بینی لە ئوتێل ئەبوسەنا کە شوێنی مانەوەی ئێمەش بوو، ئەو کەمێك خزمی دایکم بوو، پێم ووت کە حاڵ و مەسەلە وایە و هەموو شتەکانم بۆ گێڕایەوە، کاك نوری سەیری پێهات و ووتی من قسەی تیا دەکەم، پاش دوو رۆژ پەیوەندیان پێوە کردین کە بچین بۆ بارەگای سەرۆکایەتی هەرێم و جەنابی سەرۆك دەمانبینێت، چووین ئەو ساتەی گەیشتینە بارەگاکەی خوا هەڵناگرێت کاك مەسعود هاتە پیریمانەوە و زۆر بە گەرم و گوڕی پێشوازی کردین، لەگەڵمان دانیشت و لە هەواڵمانی پرسی. جارێکیتریش سوپاسگوزاری بۆ ئەو بنەماڵەیە دەربڕی و رووی کردە کاك فازڵ پێی ووت ئێمە هەمیشە خۆمان بە قەرزاری بنەماڵەی ئێوە دەزانین، هەرکات گەڕایتەوە عیراق پێم خۆشە سەردانی کوردستان بکەیت دەرگای من بە رووتاندا کراوەیە، بە کەسوکارو خزمەکانیشت

بڵێ هەر کارێك و پێویستیەکیان بوو ئێمە بە کەسی خۆیان بزانن و لە خزمەتیاندایین. ئەم قسانەی کاك مەسعود بۆ من زۆر گەورە بوو چونکە پێشتر هەستم بە شەرمەزاری دەکرد کە ئێمە یەکێ لە ئامانجەکانمان لە گەڕانەوەمان بۆ کوردستان سەردانیکردنی ئەو بوو کە نەدەگەیشتین پێی، بۆیە سودم لەو پێشوازیە گەرمە و ئەو هەموو رێزگرتنەی وەرگرت و ووتم فرسەتە بۆ پێی نەڵێم ئێمە چەند مانگە دێین و دەچین پێمان دەڵێن کاتی نیە بتانبینێت، کە ئەوەم پێ ووت و ئەوەی روویدابوو وە ئەوەی پێمان وترابوو بۆم گێڕایەوە، زۆر داوای لێبوردنی کرد و ووتی کەس ئەوەی بە من نەووتووە، دوێنێ پێیان ووتووم لێرەن پێم ووتوون با هەر ئەمڕ بفەرمون من لە خزمەتیاندام بەڵام ئێوە لە سلێمانی بوون و ووتویانە بۆ سبەی فریا دەکەون، ئیتر جارێکی تر کۆمەڵێ وەسفی چاکە و ئازایەتی ئەو بنەماڵە عەرەبەی کرد و کۆمەڵێ ستایشی منیشی کرد کە تۆ رەمزی ئەنفال و مەزڵومیەتی میللەتەکەمانی، ئەرکمانە هەموومان رێزت لێبگرین و داوای کرد هەرکات ویستمان سەردانی بکەین دەرگای کراوەیە.

بەڕاستی ئەوەندە رێزی گرتین ئیتر نە من و نە کاك فازڵیش هیچ لە دڵمان نەماو گەلێك سوپاسمان کرد و خۆشحاڵی خۆمان دەربڕی بۆ ئەو پێشوازییە گەرمەی و گەڕاینەوە بۆ سلێمانی و دوای چەند رۆژێك چووینەوە بۆ ئەمریکا. لەوەو دوایش جارێکیتر لە نوسنگەی

حکومەتی هەرێم لە ئەمریکا خۆی و کاك نێچیرڤانم بینیەوە و لەوێش زۆر رێزی لێگرتم.

- **ئەگەر بڕیار بێت وەك رەمزی مانەوەی ئەنفال و تاکە رزگاربووی ناو گۆڕی بەکۆمەڵی ژن و منداڵە ئەنفالکراوەکان، تۆ بڕیار لەسەر چارەنوسی گۆڕەبەکۆمەڵەکان بدەیت، پێت باشە چیان لێبکرێت.**

– وەڵا خۆی لە راستیا پێویستە هەموویان بهێنرێنەوە بۆ کوردستان، وە دەبێت لە رێگەی پشکنینی (dna) هەوڵبدرێت هەموویان بناسرێنەوە و هەرکەس بدرێتەوە کەسوکاری خۆی و ئارەزووی دڵی کەسوکارەکەی کوێ دەخوازێت لەوێ بنێژرێت. بەڵام وەك نەتەوەیەکیش کە بەو جۆرە جینۆساید کراوین پێویستە چەند هێمایەك هەبێت بۆ نیشاندانی تاوانەکە بەرانبەر بە کورد، بۆیە ئەوەی بڕیاری لەسەر دراوە کە چەند مۆنۆمێنتێك دروست بکرێت و رووفاتەکان بهێنرێنەوە بۆ ناو ئەو مۆنۆمێنتانە، ئەوەش باشە بەڵام دەبێت شوێنی شایستەیان بۆ دروست بکرێت و لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەبێ پشکنین بکرێت و هەوڵبدرێت بناسرێنەوە تا کەسوکاریان بزانن کامە گۆڕی کوڕو کچ و خوشك و برا و باوك و دایکی ئەوانە. وەك خۆشم لەبەر ئەوەی خەڵکی گەرمیانم و ئێستاش هاتوومەتەوە لە ئۆردوگای سمودی جاران و رزگاری ئێستا لەناو ماڵی کەسوکاری ئەنفالەکان دەژیم و مۆنۆمێنتی (دێ بنە) بەرانبەر ئەم شوێنەی

ژیانمە، بۆیە دەمەوێ کەسوکارەکەی من بهێنرێتەوە و لەم مۆنۆمێنتەی (دی بنە) بەخاك بسپێردرێن.

- **لەوەتەی ئەم مۆنۆمێنتە دروستکراوە سەردانت کردووە.؟**

- بەڵێ کاتێ باسیان کرد کە مۆنۆمێنتێك لێرە دروست کراوە زۆرم پێخۆش بوو وە هیوای ئەوەم دەخواست لەسەر شێوازی ئەو مۆنۆمێنتانەی کە لە دنیادا بۆ تاوانە هاوشێوەکانی ئەنفال و کۆمەڵکوژییەکان دروست کراون بەو جۆرە شتێکی شایستە بێت، کاتێ ویستم بچم بۆ بینینی چەند پۆلیسێك بۆ پارێزگاریکردنی دانراون نەیانهێشت بچمە ژوورەوە. زۆرم پێناخۆش بوو زۆریش ئازارم پێی چەشت کە بەو جۆرە مۆنۆمێنتێك بەرێوەببرێت نەزانن چۆن رێز لە قوربانیەکانیان بگرن و تاکە دەربازبووی ئەو کارەساتە نەناسنەوە ئیتر کامەیە بایەخپێدان بۆ بە ئەرشیف و دیکۆمێنتکردنی تاوانەکە. هەرچەندە دوای هەندێ مشتومڕ و دوای ئەوەی خۆم پێناساندن دەرفەتیاندام بچمە ژورەوە، بەڵام لە ژوورەوەش ئەوەی بینیم جارێ ناتوانم بڵێم ئەمە مۆنۆمێنتە، تەنها وەك گۆڕستانێك وایە کەمێك جیاوازتر لە گۆڕستانەکانی لای خۆمان، لە ئەمریکا و ئەورووپا و لە زۆر وڵات گۆڕستانی ئاساییان لەم مۆنۆمێنتانە جوانتر کراون. بۆیە هیوادارم حکومەتی هەرێم ئەگەر ناتوانێ شتی جوانتر بکات هیچ

نەبێت هەوڵبدات لەسەر شێوەی مۆنۆمێنت و یادگارییەکانی جیهان دروستی بکاتەوە.

- **دوای ئەو هەموو کارەسات و مەینەتییەی لە ئەنفال و بۆ تۆ لەدوای ئەنفالیش بەسەرت هاتوون، ئەگەر بپرسم کەسێک هەیە لە ژیانتدا خۆت بە قەرزاری بزانیت.؟**

– بەڵێ، پێش هەموو کەس خۆم بە قەرزاری دایکم و باوکم و خوشکەکانم دەزانم، کە ئەوان بەو جۆرە زوڵمیان لێکراو شەهید بوون، من نەمتوانی هیچیان بۆ بکەم، تەنانەت دایکم و هەرسێ خوشکەکەم ئەوە 25 ساڵە ئەوان لەو بیابانانەی سەماوە لە غەریبیدا لەناو لمی بیابانن و من شوێنەکانیان دەزانم نەمتوانیووە بچم رووفاتەکانیان بێنمەوە بۆ کوردستان، رەنگە ئەوە خەتا و کەمتەرخەمی من نەبووبێت و ئەرکی حکومەتی کوردستان بێت، بەڵام دەبوو من شەڕی زیاتریان لەسەر بکەم.

هەروەها خۆم بە قەرزاری ژن و پیاو و گەورە و بچووکی بنەماڵەی ئالعێشم دەزانم کە ژیانی بنەماڵەیەکیان خستە مەترسییەوە بۆ پاراستنم، نەك هەر منیان پاراست بەڵکوو نەیانهێشت بێ نازی دایك و باوکم پێوە دیاربێت و گەورەیان کردم و هێنامیانەوە بۆ کوردستان. وە خۆم بە قەرزاری ماڵی مام جەلال دەزانم کە نزیکەی شەش ساڵ وەك کوڕی خۆیان لەماڵەکەی خۆیان هێشتمیانەوە و

خزمەتیان کردم. هەروەها خۆم بە قەرزاری ماڵی دکتۆر بەرهەم دەزانم کاتێ چوومە ئەمریکا کە نە زمانم دەزانی و نە کەسم دەناسی ماڵی دکتۆر بەرهەم ماوەی حەوت مانگ بردمیانە ماڵی خۆیان و زۆر یارمەتیدەرم بوون. کەسانێکیش هەن کە پێم خۆشە لێرەوە سوپاسیان بکەم، لالە سەرحەدی خەلیفە یونس کە لەسەردەمێکی سەختدا بەکەڵکمان هات و پشت و پەنامان بوو. هەروەها کاك هێمنەڕەش ئەو ماوەیەی لە قەڵاچوالان بووم تا مام جەلال هاتەوە زۆر هاوکارم بوو. وە دەمەوێت زۆر سوپاسی (عارف قوربانی) جەنابیشت بکەم کە خۆت تەرخانکردووە بۆ نوسینەوەی ئەنفال و دەزانم بەم کتێبەی منیشەوە زۆر ماندوو بویت.

- **ئەی ئەگەر بپرسم و بڵێم گللەیەت لە کێ هەیە.؟**

– گللەیم لە حکومەتی هەرێمی کوردستانە کە بەپێی پێویست ئاوڕی لە ئەنفال نەداوەتەوە، بایەخی بە بەجێماوانی ئەنفال نەداوە، هیچیشی بۆ رزگاربوانی ئەنفال نەکردووە. ئەوە لە ساڵی 1991 وە ئەم بەشەی هەرێمی کوردستان ئازادە ئایا ئەو کارکردنەی لەسەر ئەنفال بۆ بەئەرشیفکردن و دیکیۆمێنتکردنی کراون، دەکرێت بڵێین بەرهەمی 22 ساڵە، کوان ئەو سەنتەرانەی بۆ توێژینەوە و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەنفال دامەزراون، ئایا هیچ سەنتەر و ناوەندێکی زانستیمان هەیە. کوا لەکام زانکۆ و پەیمانگاکانی کوردستان بەشی تایبەت بە ئەنفال

و جینۆسایدناسی کراونەتەوە، چیمان کردووە بۆ ئەوەی بە نەوەکانی داهاتوومان بڵێین ئەم تاوانانەتان بیر نەچێتەوە. چەند کتێب لەسەری نوسراون، چەند کتێب وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و زمانە زیندووەکانی تری جیهان، کامە فلمی دیکۆمێنتاریمانە تا لەرێیەوە نەوەکانی خۆمان و جیهان بەم تاوانە ئاشنابن. پێویست بوو ئەنفال بکرێتە پرسێکی گەورەی نیشتمانی و بەشێك لە توانا مرۆیی و مادییەکانی حکومەتی بۆ تەرخان بکرایا، پێویست بوو بەهەر ناوچەیەکی ئەم کوردستانەیا تێپەڕبوایت رەمزو هێمایەك هەبوایا بۆ ئەنفال و هەمیشە لەبەرچاومان بوایا، دەبوو رووفاتی ناو گۆڕەبەکۆمەڵەکان هەموو بهێنرایەوە، کاکە ئەو فرسەتەی لە عیراق بۆ کورد دروست بوو لە دوای کەوتنی سەدام لە 2003 بۆ هیچ میللەتێك دروست نەبووە، کورد دەیتوانی لەم دەساڵەدا هەموو خاکی ناوەڕاست و خوارووی عیراق، هەموو بیابانەکانی ئەم وڵاتە ژێروژوور بکات و نەك هەر ئێسك و پروسك، دەبوو هەموو تاکە پێڵاوی ئەنفالکراوێکیشمان بهێنایەوە و لە مۆزەخانەدا دابنرایان و نیشانی دونیا بدرایا. بەڵام بەداخەوە ئەو خەمە نابینم کە زۆر بە پەرۆشەوە کار لەسەر ئەوە بکرێت، ئەوە سەدام دە ساڵە روخاوە من دەیانجار ووتوومە شوێنی گۆڕەبەکۆمەڵەکان دەزانم و ئامادەم هەرکات بڕیار لەسەر هەڵدانەوە و هێنانەوەیان درا بێم و هەموو شوێنەکانتان نیشانبدەیم، بەڵام

بروابکە کەس لێی نەپرسیوومەتەوە. شتێکی تریش هەیە لام ناخۆشە ئەویش ئەوەیە لەم ماوەیە هەندێ لەو دۆستانەی ئالعێشم لێرەبوون لێم پرسین نەخۆشخانە و قوتابخانەکەیان بۆتان دروستکرد، وەڵامەکەیان ئەوە بوو نەخێر کەس بەلاماندا نەهاتۆتەوە.

- **ئەم گەڕانەوەیەی ئەمجارەت بۆ سەردانە یان دەتەوێ ئیتر لێرە بژیت.؟**

– بەڕاستی ڕۆحم ماندوو بوو لە غەریبی، ئیتر دەمەوێ لەوڵاتەکەی خۆم بژیم، لەخێروبێری وڵاتەکەم بەشم هەبێت وەك چۆن لە قوربانیەکەی بەشدار بووم.

- **هەرچەندە ئەمەیان ڕەنگە پرسیارێکی زۆر شەخسی بێت، دەتوانم بپرسم تۆ وەك تاکە ڕزگاربووی ناو گۆڕەبەکۆمەڵەکانی منالانی ئەنفال و وەك کەسێکیش کە بویتە سومبلی ئەو تاوانە و لەسەر ئاستی دونیا خزمەتت بەناسینی ئەنفال کردووە، ئێستا کە بڕیاری یەکجارەکیت داوە لە کوردستان بژیت، وە لەبەر ئەوەی هیچ ئەندامێکی خێزانەکەشت نەماون، دەبێ ئەم حکومەتە ڕۆڵی خێزان بۆ تۆ بگێڕێت، دەتوانم بزانم ئەو موچەیەی بۆ بەڕێوەبردنی ژیانت بۆیان بڕیوویتەوە چەندە.؟**

- زۆر بەداخەوە و لەناخەوە پێم ناخۆشە ئەم قسەیە دەکەم، بەرەسمی لە حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەوەی وەك موچە من وەری دەگرم بەشی ئەوە دەكات دووجار تانکی بانزینی سەیارەکەمی پێ پڕ بکەم.

- **بۆ موچەکەت چەندە.؟**

- بڕی 250 دۆلار.

- **لەم رۆژانە حکومەت بڕیارێکی دەرکرد کە موچەی تایبەتتان بۆ ببڕێتەوە، ئەمە ئەو موچەیەیە.؟**

- نەخێر ئەم موچەیە بەحساب وەکوو زیندانی سیاسی بۆیان کردووم، ئەوەی حکومەتیش بڕیاری لەسەر داوە وابزانم هەر دوو ئەوەندەیە 500 دۆلارە، هەرچەندە هێشتا ئەو بڕیارەش جێبەجێ نەکراوە لەنێوان وەزارەتی کاروباری ئەنفال و وەزارەتی کۆمەڵایەتی دەسی دەسیمان پێدەکرێت. من لە تۆ دەپرسم ئایا من دەتوانم لە کوردستان بە 500 دۆلارەوە بکەومەوە سەر سکەی ژیان.

- **لەوەتەی سەدام روخاوە کەرکوك کورد حوکمی دەکات و ئارامە، ئەو چەند جارەی لە ئەمریکاوە گەڕاویتەوە بۆ کوردستان، هیچ جارێك سەردانی قلعەکانی ئۆپێراوالات نەکردۆتەوە لە کەرکوك.؟**

- نەخێر نەچووم و ناشمەوێت بچمەوە ئەو شوێنەی کە لەگەڵ باوکم لەیەك جیاکراینەوە.

• **ئەی نەچوویتە قۆرەتوو، تا وەك یادەوەرییەکی تاڵ بیبینیتەوە.؟**

- نەخێر.

• **ئەی ملەسورە.؟**

- نەخێر بۆ ئەوێش نەچوومەتەوە.

• **ئەی گوندەکەی خۆت کوڵەجۆ.؟**

- بەڵێ لە ساڵی 2005 کە یەکەمجار گەڕامەوە ڕۆیشتم بۆ کوڵەجۆ، زۆر جاری تریش چوومەتەوە و لە ئایندەشدا هەر دەچمەوە.

• **پێش ئەوەی دەستگیربکرێن باستکرد کە باوکت کلاشینکۆفەکەی لە ئاوایی شاردەوە، تۆ کە گەڕایتەوە بۆ کوڵەجۆ، کلاشینکۆفەکەت دەرهێنایەوە.؟**

- نەخێر چونکە من چاوم لێی نەبوو کە لەچی شوێنێك چەکەکەی شاردەوە تا ئێستا بتوانم دەریبێنم، هەرچەندە وەك یادگارییەك حەزم دەکرد بتوانم بیدۆزمەوە.

- **چویتەوە شوێنی خانووەکەی خۆتان، ئەو ژورەی تیایدا ژیابووی، شوێنی یادەوەرییەکانت.؟**

– بەڵێ، بەڵام هەمووی لەگەڵ زەویدا تەخت بووە.

- **ئێستا چەند ماڵ گەڕاونەتەوە بۆ کوڵەجۆ.؟**

– رەنگە 15 ماڵ ببێت.

- **هیچ پرۆژەیەکی خزمەتگوزاریان بۆ کراوە.؟**

– پرۆژەی وەك چی.؟ چونکە لێرە هەندێ شت ناو دەنێن پرۆژەی خزمەتگوزاری سەرەتاییترین مافی ژیانن.

- **بۆ نمونە قوتابخانە، رێگاوبان، ئاو و کارەبان هیچ کام لەوانەی بۆ کراوە.؟**

– وابزانم تۆ خۆت (گوین) دەناسیت، ئەوەی کار لەسەر جینۆسایدی کورد دەکات، پێم وایە نێچیرڤان بارزانی هاوکاری دەکات، ئەو فلمێکی دەکۆمێنتەری لەسەر ژیانی من کرد، کاتێك نێچیرڤان بارزانی فلمەکەی بینی بوو کە من خەڵکی کوڵەجۆم و تاکە رزگاربووی ناو گۆڕی بەکۆمەڵی ژن و مناڵە ئەنفالکراوەکانم بڕیاریدابوو هەندێ شت بۆ کوڵەجۆ بکەن، ئێستا شەقامێکی قیر لە ناو ئۆردوگای سمودەوە

دروستکراوە بۆ کوڵەجۆ، قوتابخانە و بنکەیەکی تەندروستی و کارەباشی بۆ راکێشراوە.

- **ئەگەر دوا پرسیارم ئەمە بێت لەگەڵ هیوای تەمەن درێژی بۆتان، هەرکاتێک مردیت پێتخۆشە لە کوێ بتنێژن.؟**

– وەڵاهی لەڕاستیا لەبەر ئەوەی دایکم و باوکم و خوشکەکانم گۆڕیان نیە، ئەوەی هیچ بایەخێکی نەبووبێت لام یان بیرم لێی نەکردبێتەوە ئەوەبووە کە هەرکاتێك مردم لەکوێ بنێژرێم. بەڵام لەبەرئەوەش کە بێ هیوا نەبوومە لەوەی کە رووفاتی ئازیزەکانمان بهێنرێتەوە بۆ کوردستان و پێشتر ئەوەم ووت کە حەز دەکەم رووفاتی دایکم و خوشکەکانم و باوکم لە مۆنۆمێنتی ئەنفال لە گەرمیان بەخاك بسپێردرێنەوە، بۆیە داوا دەکەم هەرکات و لەهەر شوێنێك مردم، وەك رەمزێکی ئەنفال و وەك تاکە رزگاربووی ناو گۆڕەبەکۆمەڵەکانی ژن و مناڵانی ئەنفال لەناو مۆنۆمێنتی (دێبنە) لە گەرمیان شوێنێکم بۆ دیاریبکرێت و لاشەکەم لەوێ بنێژرێت. بۆ ئەوەی هەمیشە لەگەڵ رۆح و لاشەی ئەنفالکراوەکانبم.



تەیمور دوای رزگاربوونی لە گۆڕەبەکۆمەڵەکان/ لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی لە سەماوە



تەیمور و عارف قوربانی/ یەکێک لە دانیشتنەکانی چاوپێکەوتنەکە





ماڵی ئێستای تەیمور/ لەگەڕەکی ئەنفالەکان- رزگاری- کەلار



شوێنی ئەو فیشەکەی لە ناو چاڵی گووللەبارانکردنەکە بەر پشتی تەیمور کەوتووە



یەکەم گەڕانەوەی تەیمور بۆ کوڵەجۆ/ خاکی گوندەکەی ماچ دەکات



تەیمور لە دانیشتنی دادگای باڵای تاوانەکانی عیراق و شایەتیدانی بەرانبەر سەدام 2006/11/27



یەکەم گەڕانەوەی تەیمور لە ئەمریکاوە بۆ سەماوە لە 2009/ بۆلای ئەو ژنەی شوێنی دایکی گرتەوە و بەخێوی کرد.



تەیمور لەگەڵ مام جەلال سەرۆک کۆماری عیراق 2009



تەیمور لەگەڵ مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان



مام جەلال و تەیمور/ فازڵ و حسێن و محمد ئەو بنەماڵەیەی تەیموریان رزگارکرد/ سلیمانی 2009 دەباشان



تەیمور لەگەڵ نێچیرڤان بارزانی / ئەمریکا




بەشداریکردنی تەیمور لە ناساندنی تاوانەکانی سەدام



تەیمور لەگەڵ کۆڵن پاوڵ 2004 لە کۆڕێکی هاوبەشدا سەبارەت بە تاوانەکانی سەدام لە عیراق



سەردانی تەیمور بۆ گوندی ئالعێشم و خوێندنەوەی
وتارێك لە مەراسیمی پێشوازیکردنیدا



ئیبراهیم مەیالی
پارێزگاری سەماوە لە پێشوازیکردنی تەیمور 2009



تەیمور لەگەڵ بەشێك لەو بنەماڵە عەرەبەی رزگاریان کرد



جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگای سەماوە و چەند کەسایەتیەکی خێڵە عەرەبەکانی ناوچەکە لە پێشوازی تەیموردا



تەیمور لەو ماڵەی سەماوە کە زیاتر لە دووساڵ بەنهێنی پاراستیان



کەریمە ئەو کچەی تەیموری فێری زمانی عەرەبی کرد



تەیمور لەگەڵ غانم ئەو پیاوەی یەکەم شەو لە بیابان رزگاریکرد



تەیمور لەشوێنی بەکۆمەڵکوشتنەکەیان لەبیابانەکانی سەماوە

چەند دیمەنێك لە مەراسیمی پێشوازی بەرپرسان و سەرۆك خێڵە عەرەبەکانی سەماوە لە تەیمور ساڵی 2009





ئیبراهیم مەیالی پارێزگاری سەماوە



ئێستای تەیمور لە گەڕەکی ئەنفالەکان –
ئۆردوگای رزگاری

پێشتر باوەڕم وابوو کە خواوەند ڕۆژی قیامەتی بۆ هەق و حسابی زاڵم و مەزلوم داناوە. بەڵام کاتێ چوومە دادگا و بووم بەشایەتحاڵی بەکۆمەڵکوشتنی ئەنفالەکان لەسەر سەدام. ئەو باوەڕەم لادروست بوو کە خودا لەسەر زەوی تۆڵە لە زاڵمەکان دەکاتەوە.

